* ناوی کتێب: بەرزاییەکانی سەرکەوتن.
* نووسەر: عومەر عەبدوڵڵابەگی.
* پیتچنین: محەمەدئەمین شاسنەم.
* نەخشەسازی: رزگار موحسین.
*سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود.
* بەرگ: فواد ئەحمەدی.
* بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (٢٤٢ ).
* چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر.
* تیراژ: ٥٠٠ دانە.
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٢٤٩٩)ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە.

# پێشەکی

بە پیر بانگەوازی گۆڤاری سروە، بە دوای ئەو وشانەدا دەگەڕام کە لە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی هەژاردا نەبوون. لەم گەڕان و پشکنینەدا، تووشی وشەی وا هاتم کە لە هیچ فەرهەنگ و فەرهەنگۆکێکدا وەبەر چاو نەدەکەوتن. بۆ نموونە نێوی شار و گوند و کەژ و ڕووبار.

خەڵکی ئاسایی نازانن ئەو نێوانە لە کوێوە هاتوون، لە چییەوە وەرگیراون و واتایان چییە و کەسانی پسپۆڕ و لێزانیش بە هۆگەلی جۆراوجۆر بەم بوارەدا نەڕۆیشتوون و خۆیان لێ نەداوە. بۆیە بڕیارم دا بە پێی توانای خۆم لەم وشانە بکۆڵمەوە و ڕیشە و ڕەگەزیان دیاری کەم و نەهێڵم چی دی لە تاریکی و بێدەنگیدا بمێننەوە.

بەڕێوەبردنی ئەم بڕیارە زۆری پێ چوو و درێژەی کێشا. کەلێن و قوژبنی کتێبان نەما سەری پێدا نەکەم، بە هیوای ئەوەی مانای گوم و نادیاری وشەکان بدۆزمەوە و بە خەیاڵی خۆم ماناکەیان ڕوون کەمەوە. نایشارمەوە، جاری وا بوو سێ ساڵ بە دوای «وجە تسمیە» یا ڕەگەزی وشەیەکدا گەڕاوم تا توانیومە لێی نزیک ببمەوە.

ئەگەر بە وردی باسی ئەو کارانەی کردوومە بکەم، ماندوو دەبن و سوودیشی بۆ هیچ لایەکمان نییە. بۆیە لێرەدا کورتی دەکەمەوە و تەنیا ئاماژە بە چەند خاڵی پێویست دەکەم:

ـ لەم پڕۆژەیەدا سنوورێکم بۆ توێژینەوە دیاری کردووە. تەنیا باسی ئەو وشە و نێوانە دەکەم کە لە چوارچێوەی دەوڵەتی ماننادا، جێیان بۆتەوە (دەوڵەتی ماننا بریتی بوو لەم شارانە: ورمێ، شنۆ، پیرانشار، سندووس «نەغەدە»، مەهاباد، سەردەشت، بانە،میاندواو، مەلیکان «مەڵکەندی»، بناو، مەراغە، بۆکان، شاهیندێژ «سایەنقەڵا»، تیکانتەپەی هەوشار «تیکاب»، سەقز تا کێوی چلچەمە.

ـ ئەم کتێبە هەنگاوێکە بۆ دیتنەوەی بنچینە و ماکەی نێوی ئەو وشانەی ئاماژەیان پێ کراوە.

خوێنەرانی بەڕێز نابێ وەک «دایرةالمعارف» یا «کەشکۆڵ» چاوی لێکەن و چاوەڕوانی ئەوە بن هەموو شتێکی تێدا بێ. ئەوەی لەم کتێبەدا نووسراوە بۆچوون و تێبینی منە، دیارە بێ هەڵە و پەڵە نییە و پێشم وا نییە ئەوەی گوتراوە قسەی کۆتایی و دوایین وتە بێ. عەقڵم هەر ئەوەندەی پێ شکاوە و هەر ئەوەم لە جانتادا بووە. مافی ئەوەشم نییە نووسراوە و وتەی خۆم بە «مطلق» و نەگۆڕ و ڕەها بزانم. زۆر جار شتی وام گوتووە پێم وا بووە کار تەواوە! کەچی پاشان تێگەیشتووم بۆچوونەکەم هەڵە بووە. کەوابوو لە هەموو ئەو کەسانەی کتێبەکە دەخوێننەوە تکا دەکەم بە وردی و لەسەرەخۆیی لێی بڕوانن و لە بابەت هەڵەگیری، ڕەخنە و پێشنیاری تازە ئەوەی وەبەر زەینیان دێ، بینووسن کە جێی پێزانینێکی زۆرە.

ـ وتاری سەرەتای کتێبەکە بە نێوی «سەقز چون هەردەجاران» لە پێشدا بە نێوی «سەقز و سەکا؟» لە گۆڤارەکانی ڕامان، ژمارە ١٠٦ و سروەی ژمارە ٢٣٤دا چاپ کراوە و پاش ئاڵوگۆڕ و لێ زیاد کردن دیسان دەخرێتەوە بەر دیدەی خوێنەران.

ـ سەرژمێری ماڵ و دانیشتووانی گوندەکان، سەرژمێری ڕەسمی ساڵی ١٣٨٥ی هەتاوییە (٢٠٠٦ی زایین). بۆی هەیە تا کاتی چاپی ئەم کتێبە ئاڵوگۆڕی بە سەردا بێ.

ــ ئەوەندەی لە بیرم بێ، لە بواری تۆپۆنێمیدا ("Toponymy" لێکدانەوەی ماکەی نێو «وجه تسمیه»ی شار و دێ و شوێنەکانی دیکە مطالعەی وجه تسمیه شهرها و نقاط و ذکر اسامی نواحی) تەنیا دوو کەس توێژینەوەیان کردووە و نووسراوەیان هەیە کە لێرەدا یادیان دەکەین:

یەکەم: ولادیمیر مینۆرێسکی ڕۆژهەڵاتناس و زمانزانی ڕووس لە وتارێکدا بە نێوی «ناوی مەغوولی شوێن لە کوردستانی موکریاندا[1]»

---

١ ل ٣٥، کتێبی «مینۆرێسکی و کورد»، وەرگێڕ ئەنوەر سوڵتانی، بڵاوکراوەی دەزگای موکریانی

بەشێک لە نێوی دێیەکانی ناوچەی موکریانی لە کتێبکدا بە نێوی «مینۆرێسکی و کورد» شی کردۆتەوە. کاک ئەنوەری سوڵتانی وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. چاپ کراوە و لە بەردەستی خوێنەراندایە.

دووەم: سەید ئەحمەد کەسرەوی «نووسەر و مێژووزان و لێکۆڵەری تورکزمانی تەورێزی»، لە کتێبی «زبان پاک»دا هێندێک نێوی شار و گوند و چۆم و کێوی ئێران و ئازەربایجانی داوەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەڵام لەم کتێبەدا هیچ ئاماژەیەک بە نێوی شار و گوندی کوردستان نەکراوە.

ـ نێو و عونوانی کتێبەکە «بەرزاییەکانی سەرکەوتن» یا (بلندیهای پیروزی)یە، کە واتای وشەی یۆنانیی کێوی نەکەرۆزە. هۆی هەڵبژاردنی ئەم نێوە: ١ـ نەکەرۆز یەکێک لەو تیترانەیە لە کتێبەکەدا باسی کراوە و نێوێکی کۆنی جوگرافی - مێژوویی هەیە. ٢ـ نێوی کۆنی سەقز، بەرزە بووە و لێرەشدا وشەی بەرزەی تێدایە

ـ لە بەش کردن و تەقسیماتی کیشوەری‌دا وشەی «دهستان» بۆ کۆی چەند دێ بە کار دەبرێ. لە هێندێک کتێب و نووسراوەی کوردیدا لە جیاتی ئەو وشەیە لە «دێکۆ» کەڵک وەرگیراوە. من لەم نووسراوەیەدا کەڵکم لە وشەی «دهستان» وەرنەگرتووە چونکە نە لە نێو خەڵکدا باوە و نە کوردانی پارچەکانی دیکە دەزانن چییە. وشەی دێکۆش چونکە ڕەق و داتاشراوە و خەڵک پێی ئاشنا نین، بۆ کەڵک وەرگرتن شیاو نەبووە. بۆیە وشەی «ناوچە»م بەکارهێناوە کە وشەیەکی زۆر کۆنە و لە نووسین و ئاخاوتندا بۆ خەڵک ئاشنا و ناسراوە. هەرچەند بۆی هەیە ناوچە هەمان دێهستان نەبێ!

عومەر عەبدوڵلابەگی
E-mail: berzayekan@yahoo.com

# سەقز، چون هەردەجاران[1]

تورکانی سەلجووقی کە داروەدەستەیەکی هەردەویڵ (ساراگەڕ)ی ئاسیای نێوەڕاست بوون، لە ساڵی ٤٣١ک.م (١٠٤٠ز)دا دوایین هەنگاویان بۆ داگیر کردن و داسەپاندنی خۆیان بە سەر ئێراندا هەڵهێناوە و سوڵتان مەسعوودی غەزنەوییان لە شوێنێک بە نێوی "دەندانقان" لە مابەینی شاری مەرو و سەرەخسدا تێکشکاند.[2]

ئەو سەرکەوتنە بووە هۆی ئەوەی تورکەیل پێیان بۆ ئەم وڵاتە بکرێتەوە و بە تەواوەتی باڵی بە سەردا بکێشن. هەڵبەت بەر لەوانیش دەسەڵات بە دەست غەزنەوییەکانەوە بوو کە تورک بوون. بەڵام بە هاتنی سەلجووقییەکان سەردەمێکی نوێ بۆ دەوڵەتانی بێگانە بەتایبەت بۆ تورکەکان دەستی پێکرد. کاتێ ئەو دەوڵەتە تورکانە هەموو وڵاتیان وەک جاڵجاڵووکە تەنی، دەستیانکرد بە گۆڕینی دابونەریت و فەرهەنگ و زمانی ئەم خەڵکە و پاشانیش کە مەغوولەکان (مەغوولیش یەکێ لە زاراوەکانی زمانی تورکییە)، ڕوویانکردە ئێران، ئەو گۆڕین و زەخت و زۆرییە بوارەکەی خۆشتر بوو و هیچ لەمپەرێکی لە بەردا نەما.

---

١ چەرخیچ هەر ئەو چەرخ، هەردەجارانەن (دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی)

٢ تاریخ ایران، کمبریج، ل ٢٩٩.

مەغوولەکـــان لە ســـاڵی ٦١٧ک.م (١٢٢٠ز)دا پەلامـــاری ئێرانیـــان دا و داگیریـان کـرد. بە پێـی ڕێبـازی ژیانیـان کە بریتـی بـوو لە دواکەوتـوویی و خوێنڕێژی و نەزانی، شـار و دێیـان خـاپوور کرد، مـاڵ و سـامانیان بە تـاڵان برد، خەڵکێکی زۆریان کوشت و ئەوەی نەمرد و ما، بە دیل گیـرا و ڕاگوێزرا. بە گشـتی دیـاریی ئەو هـۆزە، کوشـتوبڕی بە کـۆمەڵ، برسـیەتی و نەداری و هەژاری بوو و هیچی تر. بۆ وێنە تەواوی ژن و پیاو و منداڵ، تەنانەت سـەگ و پشـیلەی شـاری نیشـابووریان لە تـۆڵەی کـوژرانی زاوای چەنگیـز "تغاچـار" کوشت. کچە بێوەژنەکەی چەنگیز فەرمـانی دا پـاش کوشـتنی هەمـوو ئەوانەی دەجووڵانەوە، شار بسووتێنن، بیڕووخێنن، بیکێڵن و جۆی لێ بچێنن.[1]

بەڵام ئـــێمە باســـی ئەو لایەنە لە کردەوەکـــانی تـــورک و مەغـــوول و ئێلخانەکـان دەکەیـن کە پێوەنـدی بە تێکتەپانـدن و ڕووخانـدنی ژێرخـانی فەرهەنگـی گەلەکەمـانەوە هەیە. ئەوانە هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنیـانەوە هەتـا ئەو کاتەی لە دەسەڵات لابران، دەستیان داوەتە گۆڕینی نێوی کێو و چۆم و شار و دێ و تەنانەت زمانی وڵاتانی داگیرکراو و هەرئێسـتاش گرفتاری ئەو لافاوە فەرهەنگییەین. بە کورتی ئامانج و مەبەسـتی داگیرکەران لەو گۆڕینانە ئەمانە بوون:

١. خوێندنەوە و نووسین و دەربڕینی نێوە کوردییەکان بۆ ئەو تورکـانە نامۆ و دژوار و نێوە تورکییەکان بۆ ئەوان خۆشتر و ئاسانتر بووە.

٢. بـۆ ئەوەی بە خەڵکـی سـەردەمی خۆیـان و داهـاتووان بسـەلمێنن ئەو وڵاتە لە سـەرەتاوە هەر هـی خۆیـان بـووە و داگیریـان نەکـردووە. لەوەش دەچـێ ئەم قسـەیە وەڕاسـت گەڕابـێ، بۆ وێنە: ئاغـای جەمشـیدی مەحبـووبی

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩٩

نووســەری کتێبــی "تــاریخ و جوغرافیــای میانــدواو و تیکــاب و شــاهیندێژ" گوتوویە بەڵگەی ئەوەی دەوروبەری مەهاباد و میاندواو لە کۆنەوە خاک و زێدی تورکان بوون ئەوەیە کە نێوەکانیان تورکییە.[1] [چاویشی ئەوە نابینێ کە سەرانسەری خاکی ئازەربایجان پڕە لە نێوی کوردی کە لە هەموان نزیکتر، تەورێز، سەراو، بناو، میاندواو، ساردەڕۆ و کوێستانەکانی سەهەند و سەبەلانن (ساوالان؛ سەهۆلان)].

٣. بۆ ئەوەی پاش تێپەڕبوونی چەند ساڵ و سەدە و سووڕانی چەرخی ڕۆژگار، نێوە کۆنەکان لە بیر بچنەوە و لە زەین و بیری خەڵکدا نەمێنن و دیاردە و بیرەوەرییەکانی باب و باپیران بکووژێننەوە.

٤. بۆ ئەوەی زمان، دابونەریت، بوون و مانی هەموو گەلانی ژێردەستە وەک خۆیان لێبکەن و ڕەسەن بوونی خۆیان بە سەر هەمووواندا بسەپێنن. بۆ وێنە غازانخانی ئێلخانی بە مەغوولی و تورکی قسەی دەکرد و فارسیشی دەزانــی، بەڵام خــۆبەزلزانی و دەمــارگری کە ڕەگ و ڕیشــەی لە یاســای چەنگیزدا بوو، ئیزنی پێنەدەدا بە فارسی لەگەڵ خەڵک بدوێ.

کلۆدیووس جیمس ڕیچ لە گەشتەکەی ساڵی ١٨٢٠ز.دا دەگێڕێتەوە و دەڵێ:[2] «ئەودەمی لە بانە بووم، والی سنەش لەوێ بوو. لەو شوێنەی دانیشتبووین بە زمانی تورکی دوواندمی، کە ئێستا بووە بە زمانی باوی چینی خانەدان لە ئێران». وەک دەردەکەوێ بە تورکی قسە کردن شانازی بووە تەنانەت بۆ والی کوردستانیش. والی سنە لەو سەردەمەدا دەبێ

---

١ سرووەی ژمارە ١٢٠، ل ٣٠، وتاری ڕەخنەیی لەسەر کتێبی تاریخ و جوغرافیای میاندواو، محەمەدڕەئووف تەوەکولی

٢ گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان، کلۆدیۆس جیمس ڕیچ، محەمەد حەمەباقی، ل ٢٥٣

ئامانوڵڵاخـانی گەورە بـووبێ کە لە سـاڵی ١٢١٤ هەتـا ١٢٤٠ی ک.م (١٧٩٩ هەتا ١٨٢٥ز) بۆ ماوەی ٢٧ ساڵ والی سنە بووە.

لەم کتێبەدا واتـا و مانـا و مـاکەی نێـوی هەمـوو ئاوایییەکـانی سـەقز و تەنـانەت ئەو ئاوایيـانەی بە بیـر و بۆچـوونی ئـێمە لە چوارچێـوەی دەوڵەتـی ماننادا بوون و ئێستا سەر بە سەقز نین، دەدەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە و لە هەنگاوی یەکەمدا نێوی شـاری سـەقز شـی دەکەینەوە و تێڕوانینی ڕەخنەیی خۆمان لە بابەت ماکەی نـاو (وجە تسمیە)ی ئەو شـارە خـاوەن دیـرۆک و پڕ لە سەروەرییە دەخەینە بەرچاوی خوێنەران. بۆ ئەم مەبەستە بیروڕای چەند شارەزا و مێژوونووس کە لەم بوارەدا کاریان کردووە، بە سەر دەکەینەوە:

گیرشـمەن دەڵـێ: «سـەقز نێـوی خـۆی لە سـەکاییەکان یـان "سـەکە"، وەرگرتـووە هەر بەو چەشـنەی کە خۆیـان بە خۆیـان دەگوت، یـا ئیشـکۆزای هەر بەو چەشـنەی کە لە تەوڕات یـا لە نووسـراوەکانی ئاشـووریدا وایـان پێ‌گوتراوە.» [١]

«لە ڕاسـتیدا هەمـوو بەڵـگە و نووسـراوەکان ئەوە دەسـەلمێنن کە بـڕوا بکەیـن ئەوزەمـان کە سـەکاییەکان لە باشـووری گـۆلی ورمـێ (هەرێمـی مانناییەکـان) کە داگیریـان کردبـوو، نیشـتەجێ بـوون، سـەقز بـوو بە پێتەختی ئەوان و ئەوەش دەزانـین کە نێـوی تیـرە و هۆزەکـان لەسـەر پێتەخـت دادەندرێ.»

دیسـان گیرشـمەن دەڵـێ: «ماننـا، ئەو خەڵـکەی لەگەڵ لۆلۆبییەکـان و هۆرییەکان خزمایەتی و نزیکایەتییان بوو و لە نـاوچەی زاگرۆسدا نیشـتەجێ بـوون، لە سـەدەکانی ٩ و ٨ی بەر لە زایـین لە نێویانـدا نێـوە ئێرانییەکـان

---

١ ایران از آغاز تـا اسـلام، پرۆفسـۆر ڕۆمەن گیرشـمەن کۆنینەناسـی فەرەنسـی، و: دوکتـور محەمەد موعین، ل ١٢٦.

وەبەرچـــاو دەکەون. پێتەختـــی ئەوان شـــاری "ئیزرتـــا" لە ٥٠ کیلـــۆمێتری ڕۆژهەڵاتی سەقزی ئێستا بووە.[1]

دکتۆر محەمەدی موعین، مستەفا کاوە، مەلاجەلالی شافیعی و عومەری فاڕووقی بۆچوونەکەی گیرشمەنیان سەلماندووە و دووپاتیان کردۆتەوە.

دکتـور جەمـاڵ ڕەشـید ئەحـمەد دەڵـێ: «پەیـدا بـوونی شـاری "سـەکەس؛ سەقز"ی کوردی بۆ نێوی ئەو هۆزە کۆچەرە سەکسیانە دەگەڕێتەوە کە لە نێـو شـاردا بەرهەمـی خۆیـان ئـاڵوگۆڕ دەکـرد و بێگومـان هێندێکیشـیان لە سەرەدمی مێدیدا لەم شوێنە نیشتەجێ بوون.[2]

عیمـادەدین دەوڵەتشـاهی دەڵـێ: «سـوغزیم کە بە هەڵە شـاری "سـوغد"ی ماوەڕائوننەهریـان پێگوتـووە، نێـوی شـارۆچکەی سـەقزی کوردسـتان بـووە. سـۆغد یـا سـغد لە مـاوەرائوننەهر دەتـوانێ هـاونێوی شـارێک بـێ کە پـاش کۆچدانی زۆرەملی تاقمێک کورد لە ڕۆژئـاواوە بۆ ڕۆژهەڵات لە سـەر شـوێنە تازەکەیان دانابێ.[3]

چاومان بە بیروڕای چەند بەڕێز لەمەڕ چۆنیەتی نێونـان (وجە تسـمیە)ی شـاری سـەقز کەوت. زۆربەی ئەو ڕایـانە سـەرچاوەکەیان دەگەڕێـتەوە بـۆ وتەکەی گیرشـــمەنی فەڕەنســـەی کە پێیوابـــووە ئەو نێـــوە لە "ســـەکا" یـــان "سەکە"ی هۆزی سەکا وەرگیراوە. لێرەدا بۆ ئەوەی بزانین تیـرە و هۆزەکانی سەکا کێن و لە کوێوە هاتوون و چییان کردووە، بە کورتی باسیان دەکەین.

---

١ سەرچاوەی پێشوو

٢ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، جەماڵ ڕەشید ئەحمەد، چاپی بەغدا، ١٩٨٨، بەشی دووهەم، ل ١٢٩.

٣ جغرافیای غرب ایران یا کوەهای ناشناختە اوستا، عمادالدین دولتشاهی

"ئیسـکەیت" نێـوێکی هـاوبەش بـوو کە یۆنانییەکـان لە سـەر هەمـوو هۆزەکـانی نیشـتەجێی سـارا کە بە زمـانی ئێرانـی دەدوان و لە بـاکووری دەریای ڕەش و باکووری قەفقاز دەژیـان، دانـابوو. ئەوەندەی یۆنانییەکان لە بیریان بوو، ئەو هۆزانە خۆیان بە خۆیان نەدەگوت "ئیسکەیت". بە پێچەوانە وا دیارە بە خۆیان دەگوت "ئیشکیدا şkuda".[1]

پارسەکان و ڕەنگە مادەکانیش بە دانیشتووانی سارایان گوتبێ "سـەکا". هەر بەو چەشنەی یۆنانییەکان پێیان دەگوتن "ئیسکەیت" و بابلییەکان نێویان نابوون "گیمیری".[2]

دەتـوانین بڵێـین وڵاتـی جێژیـانی ئەو هـۆزە لە بەینـی چـۆمی "کـورا" و مەڵبەندی شیمالی "کیرۆفاوا" و "گەنجە" و خاکی نزیک گۆلی ورمێدا کە سـەر بە ماننا بووە هەڵکەوتبوو.

هەروەک باس کرا، ئەو هۆزە کۆچەرانەی دانیشـتووی سـارا، لە بنەڕەتدا بە خۆیـان نەدەگوت "ئیسـکەیت" یـا "سـەکا؛ سـەکە" بەڵکـو بە خۆیـان دەگـوت "ئیشکیدا". جـا ئەگەر ئەو هـۆزانە لەو کاتەدا لە نـاوچەی ماننـا بـووبێتن و ئەو وڵاتەیان داگیر کردبێ و نێوی خۆیـان لە سـەر پێتەختی ئەو دەوڵەتە دانـابێ، دەبوو ئەو نێوە ئیشکیدا بێ، نەک سەکا و سەکە و سەقز.

دەبــێ ئەوەش بڵێـین کە دیـاکۆنۆف نـاچێتە ژێـر بـاری ئەو قســەیە کە سەکاکان لە مـاوەی ئەو ٢٨ سـاڵەی (٦٥٢ـ٦٢٥ پ.ز) کە لە نـاوچەکەدا بـوون، توانیبێتیـان خـاکی ماننـا داگیـرکەن و بیخەنە ژێر چـۆکی خۆیـان. بەڵام دەڵێ نیشـتەجێ بـوونی ئەوان لە مانـنـادا ڕاسـتییەکە بە بەڵگە و سـەنەدی مێژوویـی

١ مێژووی ماد، دیاکۆنۆف، بەشی ٣، ل ٢٢٦-٢٣٤.

٢ مێژووی ماد، ل ٢٢٦-٢٣٤

سەلمێندراوە. بەڵام ناتوانین بڵێین ئەوانە ماننایان داگیر کردووە و پاشایەتی ئیسکەیتەکان هەر ئەو خاکەی ماننا بووە. لە ڕاستیدا بۆی هەیە ئەو هۆزە جار جار وەک دوژمن و جارجاریش وەک دۆست، لە ماننا مابێتنەوە.[1]

ئەگەر ددان بەوەدا بنێین کە سەکەکان لە کاتی داگیرکردنی ماننا نێوی خۆیان لە سەر پێتەخت دانابێ (گیرشمەن بڕوای وایە) و مانناییەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نەبووبێ بەری ئەو کارە بگرن، ئەی پاش بەزین و هەڵاتن و تێکشکان بە دەست هێزەکانی پادشای ماد (هۆوەخشەتەرە: کیاکسار، لە ساڵی ٦٢٥پ.ز) نەدەکرا دەوڵەتی ماد نێوی زۆرەملی و داسەپاوی دوژمنی خۆی لەسەر پێتەختەکەی لابا و بیگۆڕێ؟ ئەوەش دەزانین مادەکان پاش ئەو سەرکەوتنە هەتا ساڵی ٥٤٩ی پێش زایین، نزیک بە ٧٥ ساڵ لە دەسەڵاتدا مانەوە و کات و دەرفەتی ئەوەیان بووە ئاسەوار و نیشانەی دوژمن و داگیرکەر بسڕنەوە. ئەگەر پێشمان وابێ دەوڵەتی ماد ئارەزوومەندانە ئەو نێوەی نەگۆڕیوە، ڕاست و جێی باوەڕ نییە، چونکە دوژمنایەتی ماد لەگەڵ ئەو هۆزە کە ببووە گۆپاڵی دەستی دەوڵەتی ئاشوور و دوو جار بە سەرۆکایەتی مادیس کوڕی پارتاتوا لە پشتەوە هێرشی هێنایە سەر ماد و دەوڵەتی ئاشووری لە تێکشکان ڕزگار کرد و تەنانەت لە یەکێ لەو شەڕانەدا لە ساڵی ٦٥٣ پ.ز شای ماد "فەرەوەرتیش" باوکی هۆوەخشەتەرە کوژرا، بۆ لێخۆشبوون و لەبیرچوونەوە نەدەبوو. هەروەک دیتمان شای ئازا و کارامە "هۆوەخشەتەرە" چی بەسەر ئەو هۆزە هێنا و چۆن لەگەڵیان جووڵاوە و بۆ هەمیشە شوێنەوار و دەسەڵاتی ئەوانی لە ناوچەکە سڕییەوە.

---

١ مێژووی ماد،ل٢٣١

ئەگەر ئەوە بسەلمێنین کە سەکاکان ماوەی ٢٨ ساڵ لە ناوچەکەدا ماونەتەوە، ئەو شوێنەی لێی جێگیر بوون بە پێی نووسراوەی دیاکۆنۆف بەم چەشنەیە: «لەم ڕووەوە جارێکی دیکە دەگەینە ئەو ئاکامەی کە لە سەرەتای سەدەی حەوتی پێش زایین، دانیشتووانی سارا لە باکووریماننا و دەر و دۆڵی ئاراز و ڕەنگە لە شوێنگەلی باکووریتر نیشتەجێ بووبێتن. جا هەرچۆنێک بێ لە نیوەی سەدەی حەوتی پێش زایین دەسەلاتی سەکاکان لە هیچ خاڵ و شوێنێک لەگەڵ ئاشوور هاوسنوور نەبووە.»[1] هاوسنوور نەبوون لەگەڵ ئاشوور واتاکەی ئەوەیە کە نەیانتوانیوە ماننا لە دەسەلات لابەن و خۆیان جێی ئەوان بگرنەوە و کاروباری وڵات بەتایبەت خاڵە سنوورییەکانی ڕۆژاوای ماننا و جیرانێتی ئاشوور بە دەستەوە بگرن.

بێتوو بە چاوێکی دیکە بڕوانینە ڕووداوەکە و پێمان وابێ سەکاکان لە ناوچەکانی ماد و ماننا نیشتەجێ بوون و بۆ ماوەیەکی درێژ دەسەلاتی خۆیان بەسەر ئەو مەڵبەندانەدا سەپاندووە و حوکمیان کردووە، بە بڕوای من ئەو شوێنانە دەبێ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ماد، یان نزیک بە ئەوان بووبێ و بەڵگەش بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە:

کاتێ هۆوەخشەتەرە هێزی کۆ کردەوە و سپای پێکهێنا و پاشان وەک هیرۆدۆت باسی کردووە، سەرۆکەکانی سەکای بۆ میوانییەک بانگهێشت کرد و لەو میوانییەدا زۆربەیانی کوشت و هێز و پاشماوەکانیشیان ئەوانەی توانییان هەڵاتن و خۆیان دەرباز کرد و ئەوانەی مانەوە، چوونە پاڵ دەسەلاتی ماد و ملیان بۆ دەسەلاتی هۆوەخشەتەرە دانەواند.

---

١ مێژووی ماد، ل ٢٥٨

وەک دەیبینین سەکاکان یان لە ماد ژیاون، یان لە ناوچەکانی ماد نزیک بوون و هەر بەم بۆنەیەش بووە کە لەگەڵ یەکتر هاتوچۆیان کردووە تەنانەت لە میوانی یەکتردا بەشدار بوون و هەر لەو نزیکایەتیەدا گیان و دەسەڵاتی خۆیان لە دەست داوە. کەوابوو سەکای دانیشتووی ماد ناتوانێ لە دوورەوە نێوی شاری ژێر دەسەڵاتیماننا بگۆڕێ، بەم هۆیانەی خوارەوە:

ـ مانناییەکان هەتا ساڵی ٦١٦ی ب.ز لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان (لە گۆلی ورمێوە هەتا ئاوایی بستی ڕۆژهەڵاتی کوێستانی چلچەمەی ناوچەی خورخورەی سەقز) دەوڵەتیان بووە و یەکیەتی هۆزەکانی ماد و دواتریش شایەکانی ماد (دیاکۆ، فرەوەرتیش و هۆوەخشەتەرە) نەیانتوانیوە و ئەو هێزەیان نەبووە دزە بکەنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ماننا. جا لێرەدا پرسیار ئەوەیە ئەگەر سەکاکان لە ناوچەکانی ماننا جێگیر و نیشتەجێ بووبێتن و نێوی هۆزی خۆیان لەسەر شاری سەقز دانابێ مادەکان کە لەو ناوچەیە نەبوون و دەستیان بە سەقز و شارەکانی دیکەی ماننا ڕانەگەیشتووە، چۆن و لە کوێ توانیویانە سەکاکان بۆ میوانی بانگهێشتن بکەن و بیانکووژن (لە ساڵی ٦٢٥ب.ز) لە کاتێکدا کە ١٠ ساڵ پاش ئەو تاریخەش دەسەڵاتی مانناییەکان هەر مابوو و دەوڵەتەکەیان تێکنەچووبوو؟

هەر لەبەر ئەو هۆیانەیە دەڵێین سەکاکان لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ماننا نەبوون و چونکە لە خاکی ماننادا نەبوون، نەیانتوانیوە نێوی شار و دێ و شوێنەکانی دیکە بگۆڕن، ئەویش نێوی شارێکی گرینگی وەک سەقزی ئەو ڕۆژگارە.

کەوا بوو دەتوانین بڵێین ئەو ئەفسانەیەی کە نێوی سەقز لە نێوی سەکا وەرگیراوە، هەڵبەستراوی ئەو زەینانەیە کە بیریان لە مێژووەکە نەکردۆتەوە و سەرسەرەکی بۆچوونی خۆیان دەرخواردی خەڵک داوە.

گیرشـــمەن کە نووســـراوەکانی لەم بـــوارەدا بـــووە بە ســـەرچاوەی نووسەرانی دیکە، گوتوویەتی: «ئەوەش دەزانین کە نێوی تیرە و هۆزەکان لە سەر پێتەخت دادەندرێ.»[1]

ئەو بەڕێزە جارێک شاری سەقزی بە ناوەند و پێتەختیماننا زانیوە و دەڵـێ سـەکاکان ئەو نێوەیـان بـۆ هەڵبـژاردووە و جـارێکی دیـکە گوتـوویە پێتەختـی ماننـاکـان و سـەکاکان شـاری ئیزرتـا لە ٥٠ کیلـۆمێتری ڕۆژهەڵاتـی سەقزی ئێستا بووە. خۆتان لێکیدەنەوە کامیان ڕاستە؟

بە باوەڕی من، نە سەقز پێتەختی ماننا و مادەکان بووە و نە ئەم نێوە فڕی بە سەر سەکاکانەوە هەیە. پرۆفسۆر گوداری مێژوونووسی فەڕەنسی ڕای لە سـەر ئەوەیە کە پێتەختـی دەوڵەتـی ماننـا، «ئیزێرتـوو؛ زێرتـوو» یـا ئاوایی قاپڵانتووی ئێستا بووە کە لە چەند ڕووەوە ئەم بۆچوونە لەوانی دیکە ڕاسـتترە. «هەرچەنـد تـا ئێسـتا جـێ و شـوێنی شـاری ئیزرتـا یەکلایـی نەکراوەتەوە، قەڵایچی؟ حەسەنلوو، قاپڵانتوو؟ یا شوێنێکی دیکە؟»

لە کتێبـی مێـژووی مـادی دیـاکۆنۆف بەشـی سـێهەم لاپەڕەی ٢٥٩ بەم چەشـنە باسـی هێرشـەکەی سـاڵی ٦٦٠/٥٩ ب.ز سـپای ئاشـوور بـۆ سـەر دەوڵەتی ماننا کراوە: (کاتێ سپای ئاشوور بە فەرمانی سەردار "نابووشاروو سوور" لە ساڵی ٥٩-٦٦٠ ب.ز لە چیای زاگرۆس پەڕیەوە، "ئاخسـەری" شـای ماننـا بڕیـاریدا لە کـاتی پشـوودان و حەسـانەوەی شـەوانەی ئەو هێـزانەی ئاشـوور، هێـرش بکـاتە سـەریان و تەفروتوونایـان کـا. بەڵام ئەو کـارەی بـۆ نەکرا. پەلامـاری سپای ماننا بەرپەرچ دراوە و ناچار کران پاشەکشـە بکەن. ئاشـوورییەکان هەشـت قەڵایـان کە لە مـابەینی سـنووری باشـووری ماننـا و پێتەختی ئەو دەوڵەتە «ئیزرتا؛ ئیزرتوو» هەڵکەوتبوو، داگیـر کـرد. ئاخسـەری

---

[1] ایران از آغاز تا اسلام، گیرشمەن، ل ١٢٦

پێگەی خۆی لە ئیزرتا کە لە مەترسیدا بوو گواستەوە بۆ قەڵای "ئیشتاتوو". بەڵام ئاشوورییەکان کە بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ، «ئیزرتا؛ سەقزی ئێستا؟» و قەڵاکانی نزیک بەو وەک «ئوزبیا؛ زیبیا؛ ئیزیبیا: زێویەی ئێستا» و ئوورمیاتە «ئارماییت»یان گەمارۆ دابوو، نەیانتوانی داگیریان کەن و تەنیا بە خاپوور کردنی شوێنەکانی دەوروبەر و بەدیلگرتنی خەڵک و ڕامالّینی ئەسپ و کەر و پاتاڵی گەورەی شاخدار وازیان هێنا.)

دیاکۆنۆف دەڵێ هەشت قەڵا لە مابەینی سنووریماننا و پێتەختی ئەو دەوڵەتە داگیر کرا. ئێمەش دەڵێین ئەگەر ئەوکات ئیزێرتوو پێتەختی ماننا و مەبەستیش هەر ئەم سەقزەی ئێستا بووبێ، دەیجا چۆن قەڵای زێویە کە ٥٠ کیلۆمێتر بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات لە سەقز دوورە، دەکەوێتە ئەم بەینەوە؟ ئەگەر «ئارماییت»یش ئاوایی "ساحێب" بێ، دیسان چۆن دەکەوێتە ئەم بەینەوە؟ لە کاتێکدا ٢٠ کیلۆمێتر بەرەو ڕۆژهەڵات لە سەقز دوورە.



وێنەی ٢ـ قەڵای زێویە

له لایەکی دیکەوە دیاکۆنۆف نووسیویەتی: «ئاخسەری پێگەکەی کە ئیزرتا بوو و لە مەترسی گەمارۆ و گیراندا بوو، گواستەوە بۆ قەڵای «ئیشتاتوو». وشەی ئیشتاتوو لە دوو بەش پێکهاتووە: »ئیشتا + توو». وشەی ئیشتا هەر وشەی «ئیشتار؛ عیشتار»ی خواژنی ئاشووری‌بابلییە[1] کە یەزدانی ئەوین و شەڕ و شەوگار و بەرەبەیانی و هاوتای ڤێنووس (ناهید) بووە. «توو»شماناکەی شوێن، جێ و کێوە. سەرجەمی واتای وشەی ئیشتاتوو دەبێتە شوێن و جێگەی خواژنی ئیشتار. ئەمەش ماناکەی ئەوەیە کە ئەو شوێنە جێگایەکی پیرۆز و شوێنی پاڕانەوە و ڕاز و نیاز و پەرەستنی یەزدانی ئیشتار بووە.

لێرەدا ڕەنگە هەندێ کەس پرسیار بکەن ئیشتار خودای بابل و ئاشوور بووە و چ کاری بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ماد وماننا داوە؟ دەبێ ئەوە ڕوونکەینەوە: «ئایینی بابلی لە بەشێکی گەورەی ئاسیای ڕۆژئاوا بە هێدی و هێمنی دەژیا. خەڵکێکی زۆر یەزدانێکی بابلی بە نێوی بەعل (bel)یان دەپەرست کە جێی مەردووکی کۆنی گرتبۆوە. هەروەها خواژنی ئیشتار هەتا سەردەمی مەسیحیەت ستایش دەکرا و دەپەرسترا. لە سەردەمی ئەشکانییەکان (پاش و بەر لەوانیش) بە هۆی تێکەڵاو بوونی فەرهەنگەلی ئێرانی و بابلی و یۆنانی، یەزدانەکانی ئەو گەلانە وەک یەکیان لێ‌هاتبوو و لە یەک دەچوون و هەروەک یەک چاویان لێ‌دەکرا. هەروا کە ئاناهیتا کە لە چەشنی ژنێکی جوان و ڕێکوپێک دەهاتە بەرچاو و خواژنی ئاوەکان و پیت و بەرەکت بوو، لەگەڵ ئیشتار بوون بە یەک یەزدان.

کەوا بوو دەتوانین بڵێین یەزدانی گەلانی دراوسێ لەم ناوچەیە بۆ ئەو ناوچەیە، جێ‌گۆڕینەوەیان کردووە. جا با ئەو جێ‌گۆڕین و هاتوچۆیە بۆ

---

[1] اساطیر آشور و بابل، **ف** ـ ژیران، ل ٧٦

ماوەیەکی کەم بووبێ. ئەوەش دەزانین پێش ئەوەیماننا و ماد بەهێز بن و لە سەر پێی خۆیان ڕاوەستن، فەرهەنگ و ئایین و دابونەریتی گەلانی نزیک و هاوسێ وەک ئورارتۆ، ئاشوور و بابل لە ژیانی خەڵکی ناوچەکەدا ڕەنگی دابۆوە.

ئەو ئیشتارتووەی باسمان کرد، ئێستا نێوی قەڵا یا ئەشکەوتی کەرەفتووە و لە ٦٠ کیلۆمێتری باکووری ڕۆژهەڵاتی سەقز هەڵکەوتووە. وشەی کەرەفتوو لە دوو بەش پێکهاتووە: (کەرەف: خێر، چاکە، سەواب ف ثواب) و «توو: شوێن، جێ، کێو ف جایگاە؛ مکان؛ کوە) کە **سەرجەمی ماناکەی دەبێتە** شوێنێک کە چاکە و ڕازونیاز و پاڕانەوەی لێ دەکرێ و عیبادەتگا و پەرستگەیە.



وێنەی ٣. ئەشکەوت (قەڵا)ی کەرەفتوو

ئەگەر جـوان و بە وردی سـەرنجی بـدەن، دەزانـن کە مانـای هەردوو وشـەی کەرەفتـوو و ئیشـتارتوو هەر یەکە. بـێجگە لە مانـای دوو وشـەکە، نزیکـی ئەشـکەوتی کەرەفتـوو لە ئـاوایی قـاپڵانتوو کە بە هێڵـی ڕاسـت دە کیلـۆمێتر دەبـێ و شـایماننـا لە کـاتی تەنگـانە و هێرشـی دوژمـن و نزیـک بـوونەوەی، توانیـویەتی خـۆی و بنەمـاڵە و دەسـتوپێوەندەکانی لە مـاوەیەکی کەمـدا بگەیەنێـتە ئەوێ، بەڵگەیەکـی دیـکەیە بـۆ ئەوەی سـوور بـین لەسـەر ئیزرتـوو بـوونی دێـی قـاپڵانتوو. دەبـێ ئەوەش بـزانین قەڵای کەرەفتـوو ئەشکەوتێکی بەردیـن و قـایم و لە شـوێنێکی زۆر حەسـتەمە و لە سـەردەمی خۆی کە دەوڵەتی ئاشوور، ئامراز و کەرەسەی پێشکەوتووی بۆ ڕووخاندنی قەڵا و شووره هەبووە، نەیتوانیوە ئەو شوێنە بگرێ ئەگەر گەمارۆشـی دابێ، چـونکە ئەشـکەوتێکی گەورەی سروشـتییە و ئـاوی تێـدایە، توانیـویەتی بـۆ مـاوەیەکی زۆر و دوور و درێژ میوانداری شـا و سـپاکەی بکـا هەتـا دوژمـن ماندوو بووە و کشاوەتەوە و ناوچەکەی بەجێهێشتووە.

ئەگەر بۆچوونی ئێمە هەڵەبێ و ئیزرتوو، سـەقز بێ، ئایا شـای ماننـا لە کاتی تەنگانەدا توانیویەتی خۆی بگەیەنێتە قەڵای کەرەفتوو کە ٦٠ کیلۆمێتر لە یەک دوورن؟ ئەگەریش لە سـەقزەوە پەنـای نەبردبێتە ئەشکەوتی کەرەفتوو، ئایـا لە دەوروبەری سـەقز قەڵای وای لـێ بـووە کە شـا زۆر زوو خـۆی بگەیەنێتە ئەوێ و ئەو قەڵایەش ئەوەندە قایم بووە، بتوانێ لە بەرانبەر سـپای دڕنـدەی ئاشـوور و ئورارتـۆ بـۆ مـاوەیەکی زۆر خـۆی ڕاگـرێ و دوژمـن ببەزێنێ؟

لە لایەکی دیکەوە لەو کتێبـانەی لە بەردەسـتدان، وەک مێـژووی مـادی دیـاکۆنۆف، هەمـوو کـاتێ نێـوی ئیزرتـوو و زێـویە بە یەکەوە و لەگەڵ یەک هـاتوون. جـا چـونکە ئێسـتا شـوێنی قەڵای زێـویە دیـارە و هەر بە نێـوە کـۆنەکەیەوە مـاوە، دەبـێ بیسـەلمێنین کە ئـاوایی دەستەخوشـکی زێـویە،

قەپلانتــووە کە تەنیــا ٤ کیلــۆمێتر لە زێــویە دوورە. لە بــارێکی دیکەشــەوە ئیزرتوو کە «زێرتوو»شی پێدەڵێن، لەگەڵ زێویە دوو جێ یا دوو شوێنی «زێـر» و «زێـو»یـان پێکهێنـاوە. دەبێ ئەوەش بگـوترێ کە قەڵای زێـویە لە ڕووی چۆنیەتی مێعماری، تەلار و ژووری کۆبوونەوە و ئەو قەبرانەی لەوێ دۆزراونەتەوە یا لە ڕووی ئەو هەمـوو شـوێنەوارە زێڕینە دەبێ ماڵی شـا یـا قەڵای حەسانەوە و ژیانی بنەماڵەی شا یا شانشـین بـووبێ و قاپلانتووش کە لەوێوە نزیک بووە، ناوەندێکی سپایی بووە بۆ پاراستنی زێویە.

لە پاش نێونانی سـەقز لە لایەن سـەکاکانەوە (٦٢٥ـ٦٥٢ بەر لە زایین)، لە کـام سـەنەد و بەڵـگە و تەتەڵەی (لەوحـی سـواڵەتی) ئاشـووری، ئورارتـۆیی، عیلامـی، مـادی و پارسـی ئامـاژە بە وشــەی ســەقز کـراوە؟ ئایـا شـارێکی بەنێوبانگ و بە قسەی گیرشمەن پێتەخت کە زۆر جار هێرش کراوەتە سەری و گەمـارۆ دراوە، نـابێ لە سـەر بەردێـک، شـوێنەوارێکی ژێـر خـۆڵ یـا لە نووسراوەیەک ئاماژە بە نێوەکەی کرابێ؟

سـەرنجێکی کتێبـی مێـژووی مـادی دیـاکۆنۆفی مێـژووزان بـدەن، ئەو کتێبەی کە بناغەی لەسەر دەیان بەڵگەی مێژوویی داڕێژراوە و هەمـووان بە کتێبێکی زانستی و بەنرخی دەزانن، زۆر جار باسـی قەڵای زێویە، ئیزرتـووی پێتەخـت، قەڵای بۆشـتوو (ئـاوایی بسـت لە بنـاری کوێسـتانی چـلچەمەی خورخوڕە)، ئارماییت (ئاوایی ساحێب بە وتەی گودار) و خارخار (ئـاواییەکی بەشی هەوشارە کە ئێستاش بەو نێوە ماوەتەوە) دەکا، بەڵام تەنیا بـۆ جارێک باسـی وشـەی سـەقز ناکـا. ئەوەش نیشـانەی ئەوەیە کە ئەم وشـەیە لە پـێش زایین و تەنانەت پاش زایینیش هەتا هاتنی تورکەکان نەبووە و نەناسراوە.

هیراکلیۆس ئیمپراتۆری بیزانس لە نامەیەکدا کە لە ئۆردووگایەکی نزیک گەنـزەک (ئـاوایی لەیلانـی نزیـک میانـدواو)ەوە نـاردوویەتی و لە کلیسـاکانی قوستەنتەنیە (ئیستامبووڵ) خوێندراوەتەوە، باسی هێرشی سێهەمی خۆی بۆ

سەر بەینوننەهرەین (نێوان دوو چۆمان: میانرودان)ی لە ساڵی ٦٢٨ی زایینیدا کردووە و گوتوویەتی مانگی فێوریە (ڕێبەندان: بهمن)ی ئەو ساڵە خەریکی کاول کردنی شارەزوور بووە و لە پاشەکشە و گەڕانەوەدا لە زاگرۆس پەڕیوەتەوە و لە مانگی مارسدا (ڕەشەمە: اسفند) گەیوەتە شوێنێک بە نێوی "بەڕۆژە" (berozhe) کە نێوێکی کوردییە و واتاکەشی «بەرخۆرەتاو؛ بەرهەتاو: آفتابگیر»ە. بە بیر و بۆچوونی ڕاولینسۆن ئەم وشەیە نێوی شاری بانە بووە و هەر ئێستاش ئەم نێوە ماوە و لە کتێبی گەشتی ڕیچ بۆ کوردستان لە ساڵی ١٨٢٠ی زایینی ئاماژەی پێ کراوە و ئاوا نووسراوە: «هەر بەڕاستیش نێوی بانە هی ناوچەکەیە، ئەگینا شارەکە نێوی بەررۆژەیە.»

هیراکلیۆس لەوێشەوە گەیوەتە شوێنێک بە نێوی "بەرزە" (Berze) و ماوەی حەوتوویەک لەوێ ماوەتەوە. بە ڕای ڕاولینسۆن و پرۆفسۆر مینۆرسکی، ئەو شوێنە سەقزە. بە لەبەرچاوگرتنی ڕێگا و شوێنپێ و هاتوچۆی هێراکلیۆس و سپاکەی، ئەو بۆچوونە دەسەلمێندرێ و دەردەکەوێ کە ئەو جێیە سەقزە و لەو سەردەمەدا نێوی "بەرزە" بووە.

جوغرافیازانە قەدیمییەکانی عەرەب وەک ئیبنیخوردابێە (٢٥٠ی کۆچی مانگی ـ ٨٤٦ی زایینی)، قودامە (٢٦٦ی کۆچی مانگی ـ ٨٨٠ی زایینی)، موقەدەسی (٣٧٥ی کۆچی مانگی، ٩٨٥ی زایینی)، شوێنە دیار و مەنزڵە بەنێوبانگەکانی ڕێگای «دینەوەر بۆ مەراغە» و «مەراغە بۆ ورمێ»یان دیاری کردووە و ئاماژەیان پێ کردووە. بڕواننە دوو جەدوەلی ژمارە ١ و ٢. لە نێو ئەم نێوانەدا ئاماژە بە وشەی بەرزە کراوە کە بە لێکدانەوە و بۆچوونی پرۆفیسۆر مینۆرسکی ئەم نێوە، نێوی شاری سەقز بووە. کەوا بوو نێوی شاری سەقز لە دوای زایین «بەرزە» بووە.

| | نێوی شوێن | نێوی شوێن به لاتین | ئیبنی خوردادبێه | قودامه | موقەدەسی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دینەوەر | Dinever | مەرحەلە١ | فەرسەنگ٩ | فەرسەنگ ٧ |
| ٢ | ئەلجبارجان | Al-jebarjan | ١ // | ٦ // | ٦ // |
| ٣ | تێلوان | Tell-van | ١ // | ٧ // | ٧ // |
| ٤ | سیسەر | Sisar | ١ // | ٤ // | ٤ // |
| ٥ | ئەندەرئاب | Andreab | ١ // | ٥ // | ٥ // |
| ٦ | ئەلبەیلەقان | Al-Beyleqan | ١ // | ٦ // | ٦ // |
| ٧ | بەرزە | Berze | ١ // | ٨ // | ٨ // |
| ٨ | شابوورخاست | Şaburkhast | ١ // | ٧ // | ٧ // |
| ٩ | مەراغە | meraghe | ١ // | | |

جەدوەلی ژمارە ١

| | نێوی شوێن[1] | نێوی شوێن به لاتین | موقەدەسی | قودامه | ئیبنی خوردادبێه |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مەراغە | meraghe | | | |
| ٢ | جەنزە | Jenze | م ١ | ف ٦ | ف ٦ |
| ٣ | مووسائاباد | Musa-Abad | م ١ | ٥ | ٥ |
| ٤ | بەرزە | Berze | م ١ | ٤ | ٤ |
| ٥ | تی.فلیس | T.flis | م ١ | ٢ | |
| ٦ | جەبروان | Jebrvan | م ١ | ٦ | ٨ |
| ٧ | نەیریز | Neiriz | م ١ | ٤ | ٤ |
| ٨ | ئورمیە | Urmie | م ١ | ١٤ | ١٤ |

جەدوەلی ژمارە ٢

١ ئاترۆپاتن ماد، ڕوقیەی بێهزادی، ل ٢٥

لە لایەکی دیکەوە من پێم وایە لانیکەم لەسەدەی نۆی پێشزایینەوە[1] ئەو شارە نێوی بەرزە بووە و بۆ ئەوەی بە بەڵگە ئەم بۆچوونە بسەلمێنین، ئەو چەند دێڕە لە کتێبی مێژووی ماد دەخوێنینەوە:

«لە سەردەمی هێرشە سپاییەکەی ساڵی ٨٢٠ی ب.ز.دا، ٢٧ یا ٢٨ کەس لە سەرۆک و فەرماندەرەکانی مەڵبەندە جۆراوجۆرەکانی ماد و پارسوا، بەر لەوەی شای ئاشوور لە ملەی کێوی کۆللارەوە بگەڕێتەوە ولاتی خۆی، خەڵات و دیارییەکی زۆریان دایە.»

لە تەتەڵەیەکدا (لەوحی سواڵەتی)، نێوی یەکە یەکەی ئەو سەرۆکانە و ولاتەکەیان دیاری کراوە. نێوی هەموو مەڵبەندەکان کۆن و ناوچەیی و خۆجێیین (بومی). لە ژمارە ٩٧ی بەشی دووی لاپەڕەکانی ٤٩١ و ٤٩٢ی مێژووی ماد، ناوچە و نێوەکان نووسراون کە یەکێ لەوان نێوی «بەرزووتا تائورلایی»ە.

ئەم نێوە لە چەند بەش پێکهاتووە:

(بەرز: کەڵەگەت، قوت، قووچ، قیتایی، بڵیند: ف بلند؛ بلندی)

(و: وشەی پێوەندی و نیسبەت ف حرف پیوند و نسبت)

(تا: ولات، جێ، شوێن ف محل، مکان، سرزمین)

(تائورلایی: هۆز و خێڵێکیماننایی بووە کە جیران و دراوسێی ناوچەی مسی، یا ناوچەی خوڕخوڕەی سەقز بووە. ف نام طایفەای ماننایی کە همسایە دهستان خورخورە فعلی و مسی یا مسۆ در سدەهای قبل از میلاد بودە است)

وشەی تائورلایی لە دوو بەش ساز کراوە:

(تائور؛ تەئور؛ تەوەر: وردکردن؛ وێران کردن؛ لێدان؛ تەور ف تئورو: خرد کردن؛ ویران کردن؛ زدن؛ تبر)[2]

---

١ (ئاماژە بە هێرشە سپاییەکەی ئاشوورییەکان لە ساڵی ٨٢٠ی ب.ز)

٢ فرهنگ لغت اوستایی، بهرامی

ئەم وشـەیە ئاوێسـتایی و کوردی هەورامییە و بنەڕەتەکەی بـریتییە لە: (تەوەر: "لە هەورامیدا" تەور: لە کوردی سۆرانیدا و تبر لە زمـانی فارسـیدا) + (لی؛ لایی: خاوەن ف صاحب؛ دارندە)

ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاست بێ، واتـاکەی ئەوەیە کە ئەم هـۆزە ئـامراز و کەرەسەی دەستیان بۆ کار و بـۆ شـەڕ (تەور؛ تەوەر: تبـر)ی ئاسـنین بـووە و بەو شتەوە نێوبانگیان دەرچووە)

کەوا بوو **واتای سەرجەمی ئەو وشانەی سەرەوە دەبێتە**: وڵاتـی بەرزەی هۆزی تائورلایی ف منطقە برزەی طایفەی تائورلایی.

لە لاپەڕە ٤٨٨ی مێـژووی مـاد ئامـاژە بە وشـەی "تـائورلایی" کـراوە: (ناوچەی مسۆ لەگەڵ زاموا و مەڵبەندی مادای بەتـایبەت گیزیلبوندا پێوەندی هەیە و نێوی دەبەن. لەگەڵ نـاوچەی هـۆزی ماننـایی «تـائورلی» هاوسـنوور بووە و دواتر بە ناوچەی سنووریماننا و پارسوا ژمێردراوە.)

هەروەهـا لە لاپەڕەی ١٥٨ی مێـژووی مـاددا ئـاوا نووسـراوە: (ئاشوورییەکان لە ساڵی ٨٢٠ی ب.ز هێرشێکی سپایی دوور و درێژیان کردە سەر مادەکان. «شامشی؛ ئادادی پێنجەم» لە کێوی کۆللار پەڕیەوە و دیـاری و پێشکێشیەکانی شای «بوشکیە» لە باشـووری گۆلی وان و «شارسـینا» و هۆزەکانی ماننا و »سونبیان» و «تائورلیان» (کە دواتـر بـوون بە بەشـێک لە وڵاتی ماننا) و دانیشتووانی پارسوای وەرگرت و لە خـاکی مسیەکان تێپەڕی و چـووە بەشـی سـەرووی جەغەتـوو. ئەو شـایە لەو شـوێنانە مەڕومـاڵاتێکی زۆری خەڵکی مسی بەتاڵانبرد.)

هەروەک لەو بڕگانەی سەرەوە باسکرا، ناوچەی مسی یا مسۆ یا ماساو «بە هەورامی» بەشی سنووری دەوڵەتی ماننا لەگەڵ دەوڵەتی پارسـوا بـووە. هەرچەنـد لە جێگـایەکی دیـکەدا دەبـێ بە وردی باسـی ئەو دەوڵەتـانە بکـرێ، بەڵام لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە سووکەڵە ئاماژەیەکیان پێدەکەین.

هەر لە گۆلی ورمێ بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا و باشووریەوە هەتا چۆمی سیروان، بەر لە زایین بە ولاتی زاموا ناسرابوو. وشەی زاموا لە ڕاستیدا «زامویَ»یە کە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(زام؛ زەم؛ زۆم؛ زۆمە: پێگەی هاوینی؛ سەرما؛ هاوینەهەوار؛ زۆزان؛ کوێستان ف ییلاق؛ سرما؛ سردی؛ کوهستان)[1]

ئەم وشەیە لە وشەگەلی وەک «زمستان»، «زمهەریر»، «زمەهەڕ»، «زمزیران»؛ «سۆمابرادۆست»؛ «سومار»؛ «زمار» و زۆر وشەی دیکەدا دەبیندرێ.

+ (وا؛ وێ: شوێن؛ جێ ف مکان؛ محل)

بۆ نموونە وەک:

پەسوێ (پەس؛ پەز؛ مەڕ: گوسفند + وێ) شارۆچکەیەکی نزیک پیرانشارە.

کەڵوێ (کەڵ: گامێشی نێر: گاومیش نر + وێ) چۆمی زابی چکۆلەی سەردەشت.

هەنگەوێ (هەنگ: مێشەهەنگوین: زنبور عسل + ە + وێ) دێیەکە لە ناوچەی پیرانشار.

کەوا بوو واتای تێکڕای وشەی زاموا دەبێتە: هاوینەهەوار؛ شوێنی سارد؛ کوێستان ف ییلاق؛ مکان سرد؛ محل برپایی چادر در ییلاق؛ کوهستان

زۆر دواتر و پاش هاتنی عەرەب، ناوچەی زاموا یا کوردستانیان نێو نا «**جبال**) کە هەر بە مانای کوێستان و زاموایە.

ولاتی زاموا یا زەموێ دوو بەش بووە:

ــ لە گۆلی ورمێوە هەتا دێی بست (بستوو؛ بشتوو) لە شیمالی ڕۆژهەلاتی (شمال‌شرق) زنجیرەکێوی چلچەمەی خوڕخوڕە، هەروەک لە

---

١ سروەی ژمارە ١٩٠، کوردەکانی پارس، دوکتور جەمشید سەداقەتکیش

مێـژووی مـادی دیاکۆنۆفـدا باسـی کـراوە نێـوی دەوڵەتـیماننـا بـووە. ئەم دەوڵەتە کە یەکەمین دەوڵەتی بەر لە مادەکان بووە، لە چەند ناوچە پێکهاتبوو کە یەکێ لەو ناوچانە، مسی بوو.

نـاوچەی مسـی ئێسـتا نـاوچەی خوڕخـوڕەی سـەقزە. بەڵـگە بـۆ ئەو بۆچوونە هەموو ئەو نیشانە و دیاردانەیە کە لە کتێبی مێژووی مادداا باسی کراوە وەک ناوچەی سەرووی چۆمی جەغەتوو (زرینەرود) و لەوەش ڕوون و تایبەتتر قەڵا و شوێنێکە بە نێوی «مزیوەرە» لە ئاوایی سوننەتە کە لە کەنار یا لە قەراغی چۆمی جەغەتوو هەڵکەوتووە.

مزیوەرە وشەیەکی ئاوێستاییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(مزی؛ مسی: گەورە؛ پان و بەرین ف وسیع، گسترده، پهناور)[١]

+ (وەرە: برج، قەڵا، دژ: وَرْ بە زمانی پەهلەوی ف برج، قلعه، دز، دژ، بارو)[٢]

وشەی وەرە (وَرَ) لە دەوروبەر و ئاواییەکانی سەقز لە چەند جێ وەبەر چاو دەکەوێ وەک:

* چاڵەوەرە: مەزرایەکە لە دێی حانەمیران

* دێموەرە: مەزرایەکە لە دێی دەرەویانی خواروو یا دەرەویانەویشکە

* وەرەنانی: ئاوایییەکی چۆڵکراوە لە سەرشیوی سەقز

**واتای سەرجەمی وشەی مزیوەرە:** قەڵای گەورە، قەڵای پان و بەرین ف دژ و برج و باروی وسیع و گسترده؛ باروی پهناور

ئەم وشەیە یارمەتیمان دەدا کە شوێن و جێی مسی لە دەوڵەتی ماننا و لە مێژوودا بناسینەوە.

هەروەک لە بڕگەکـانی پێشـوودا بـاس کـرا، مسـی یـا مسـۆ، جیرانـی ناوچەیەک بووە بە نێوی «بەرزووتا تائورلایی» کە دەبێتە شانی ڕۆژاوای

---

١ فرهنگ واژەهای اوستا، بەرگی ٢

٢ کتێبی (نخستین انسان و نخستین شهریار) ژالە ئاموزگار و ئەحمەد تەفەزولی، ل ٣٠٣، ٣٠٥، ٥٠١.

مســـی و ســـەقزی ئێســـتا، بە ئاواییەکـــانی دەوروبەریەوە هەر لە چـــۆمی ئایەنانەوە هەتا سەقز کە ئاواییەکانی سەرشیوی سەقز دەگرێتەوە.

هەروەک دیمان:

**یەکەم.** لە ســـەردەمی ساســـانیاندا کە هێراکلیـــۆس بـــۆ شـــەڕ لەگەڵ خوسـرەوی دووهەم (خوسـرەو پەرویـز) هـاتە ئەم نـاوچەیە، لە گـوزارش و ڕاپۆرتی خۆیدا بە ڕاشکاوی ئاماژە بە نێوی «بەرزە» دەکا و مینۆرسکی و ڕاولینسۆن دەیسەلمێنن کە بەرزە، سەقز بووە.

**دووهەم.** جوغرافیزان و گەڕیدەکانی عەرەب کە لە چەند کاتی جیاوازدا هــاتوونەتە ئێـران و ئەم نـاوچەیە، ئاماژەیـان بە نێـوی بەرزە کـردووە کە دەکەوێتە شوێنی سەقزی ئێستا.

**سـێهەم.** لە باسـی هێرشـە سـپاییەکەی ئاشـوور لە سـاڵی ٨٢٠ی پـێش زاییندا، نێوی بەرزوو یا بەرزە هاتووە و ئەوانە هەموو پاڵپشتی یەکترن و دەیسـەلمێنن کە شـاری سـەقز لە پێش زایین و دوای زایین و تەنانەت پاش هاتنی ئیسلام هەتا سەدەی پێنجەمی کۆچی مانگی (سەدەی یازدەی زایینی و هاتنی تورکەکان) نێوی ئەم شارە، بەرزە بووە و دواتر گۆڕدراوە و بووە بە سەقز.

ب. بەشـی دووهەمـی وڵاتـی زامـوا بریتـی بـووە لە دەوڵەتـی پارسـوا کە دەکەوێتە نێوان ئاوایی بستی بناری ڕۆژهەڵاتی کێوی چلچەمە هەتا چۆمی سیروان.

لێرەدا دەگەڕێینەوە سـەر باسـی ئەوەی ئایا سـەقز نێوی خۆی لە خێڵی سەکا وەرگرتووە؟

با بێین و ئەو گریمانەیە بسەلمێنین کە لە سـەدەی حەوتی بەر لە زایین یانی لە بەینی ساڵەکانی (٦٥٢-٦٢٥ ب.ز) سەکاکان نێوی خۆیان لە سـەر ئەو شـارە دانـابێ. هەروەک دیمـان و باسمانکرد پاش زایین و لە کاتی هێرشـی خوسرەوپەرویز شای ساسانی، نێوی شاری سەقز، بەرزە بووە و ئەوەش لە

لایەن پرۆفیسۆر مینۆرسکی و سێر هێنری ڕاولینسۆن و جوغرافیزان و گەڕیدەکانی عەرەب سەلمێندراوە و ددانیان پێدا ناوە.

باشە نێوی ئەو شارە لە پێش زاییندا «سەقز» و پاش زایین «بەرزە» و ئێستا دووبارە بۆتەوە بە «سەقز»؟ تۆ بڵێی سەکاکان پاش زایین زیندوو بووبێتنەوە و نێوی بەرزەیان کردبێتەوە سەقز؟ یا نوێنەریان ناردبێ هەتا ئەو کارە بکا؟ وەیا خەڵکی ناوچەکە ئەوەندە سەکاکانیان خۆشویستبێ و خێروبێریان لێ دیتبێتن کە ئەو نێوەیان لەسەر سەقز دانابێ؟ وشەی جوان و کوردی و ئاوێستایی «بەرزە»یان لابردبێ و لە جێی ئەو، وشەی سەکا و سەقزیان دانابێ کە نیشانەی داگیرکەرانە؟

لە لایەکی دیکەوە گیرشمەن و چەند کەسی تر گوتوویانە نێوی پێشووی سەقز، «ئیزرتا؛ ئیزرتوو» و پێتەختی ماننا‌کان بووە و سەکاکان نێوی هۆزی خۆیانیان لەسەر پێتەخت داناوە و بەرەبەرە و بە هێدی و هێمنی سەکا بووە بە سەقز.

پرسیار ئەوەیە ئەگەر بە هۆی ئەوەی سەقز پێتەخت بووە، ئەو نێوەیان بە سەردا بڕیوە، ئەی ئەو شوێن و شار و دێیانەی لەم وڵاتە و لە شار و ناوچەکانی دیکە نێویان سەقزە، لەبەرچی و بە چ هۆیەکەوە ئەم نێوەیان بۆ هەڵبژاردوون. وەک:

ـ ئاوایی سەقزلوو سەر بە ناوچەی بێهی شارستانی بۆکان کە لە نزیک سەدی بۆکان هەڵکەوتووە.

ـ ئاواییەکی خاپوورکراو کە ئێستا دەکێڵدرێ و نێوی سەقزلووە و لە نێوان تەمۆغە و قشلاغی ئەفغانان هەڵکەوتووە.

ـ سەقز تیرەیەکە لە هۆزی بەهارلوو لە خێڵەکانی خەمسەی پارێزگای فارس (استان فارس).

ـ سەقزچی ئاواییەکە لە شاری "نەمین"ی سەر بە پارێزگای ئاردەوێڵ (استان اردبیل)

ـ سەقزچی ئاواییەکی سەر بە ناوچەی "نیر"ی پارێزگای ئاردەوێڵە (استان اردبیل)

ـ سەقزچی ئاواییەکی سەر بە ناوچەی "ئاغیمون"ی شارستانی سەرابی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات.

جا بە هۆی هەموو ئەو بابەتانەی باسمان کرد، پێم وایە وشەی سەقز تورکییە و واتاکەشی «بنێشت، جاچکە: شیرەی دارەبەن؛ بنێشتێکی لە داری قەزوان دەگیرێ (آدامس حاصل از درخت ون یا درخت بنه. بە کوردی وەنەتەق و بە تورکی چاتلانقووش و بە فارسی پستەی وەحشیشی پێ دەڵێن.)

تورکی بوونی وشەی سەقز شتێکی ئاساییە هەروا کە لە ٣١٠ ئاوایی ئاوەدان و چۆڵکراوی سەقز، نزیک بە ٨١ دێ نێوەکانیان تورکی و مەغوولیە و ئەوە دەکا ٢٦ لە سەتی نێوەکان. بۆ نموونە ئەو ئاواییانەی دەوروبەری شاری سەقز هەموویان تورکین: خوردەلوکی، کەچەڵمینگان، مەڵقەرەنی، ئایەنان، تاوەقڕان، ئاڵتوون و..

هۆی سەرەکی ئەو نێونانەش لە لایەن تورک و مەغوولەوە ئەوە بووە کە تەواوی دەوروبەری زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس بەتایبەت کوردستان و سەقز، گیا و پنچک و دارستانی خۆڕسک بووە و یەکێ لەوانە داری قەزوان یا دارەبەن بووە کە بنێشتێکی زۆری لێ گیراوە. ئەم بەرهەمە زۆر بەکەڵک و بایەخدار بووە و لە کۆنەوە بەشێکی گەورەی داهات و هەناردەی ناوچەکەی پێکهێناوە و هەر بەم بۆنەیەوە نێویان ناوە سەقز یا بنێشت کە نێوێکی گونجاو لەگەڵ بارودۆخی ناوچەکە بووە.

ئێستا ئەو دارە لە ناوچەکەدا ماوە و لە ئاواییەکانی ئەبولمەوئمێن (ابوالمؤمن) و چیچیخوار و عەلیئابادی ناوچەی ساحێب بە کۆمەڵ و لە زۆر شوێنی دیکە بە تاقولۆق وەبەرچاو دەکەوێ.



وێنەی ٤. هێندێک کەلوپەلی دۆزراوە لە زێویەی سەقز

**ڕێنوێنی:**

ئەو ئـاوایی و چـۆم و کێـوانەی لەم کتێـبەدا نێویـان هـاتووە، بە پیـت و ڕێنووسی لاتین نووسراون و خوێنەران پێویستە بە سەرنجەوە بیانخوێننەوە. بۆ بەراورد کردن لە گەڵ شـێوە نووسـینی ئینگلیسـی ئامـاژە بە چەند پیت لە هەردوو زماندا دەکەین:

| پیت | ئینگلیزی | لاتین |
|---|---|---|
| چ | ch | Ç |
| ق | gh | Q |
| ش | sh | Ş |
| خ | kh | X |
| ج | g | C |

بۆ وێنە وشەی بۆگەبەسی بە لاتین دەنووسین: Bogebesî

**ئەلفوبێی کوردی**

| **کوردی** kurdî | **لاتین** Latîn | | **کوردی** kurdî | **لاتین** Latîn | | **کوردی** kurdî | **لاتین** Latîn | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئا. ـا. ا | a | A | ئـ | i | I | سـ . س | s | S |
| بـ . ب | b | B | ئیـ . یـ . ی | î | Î | شـ . ش | ş | Ş |
| جـ . ج | c | C | کـ . ک | k | K | تـ . ت | t | T |
| چـ . چ | ç | Ç | لـ . ل | L | L | ئو . و | u | U |
| د | d | D | مـ . م | m | M | ئوو . وو | û | Û |
| ئه. ـه. ه | e | E | نـ . ن | n | N | ڤـ . ڤ | v | V |
| ئێ ـێ ێ | ê | Ê | ئۆ . ۆ | o | O | و | w | W |
| فـ . ف | f | F | پـ . پ | p | P | خـ . خ | x | X |
| گـ .گ | g | G | قـ . ق | q | Q | یـ . ی | y | Y |
| هـ . ـهـ | h | H | ر | r | R | ز. ـز | z | Z |

# ئایچی

**Ayçî** **آیچی**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی تەمـۆغەی شارسـتانی سـەقز. ١٥١ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٦٩ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئـای؛ ئـایی: ورچ؛ حـورچ؛ حەش ف خـرس)[١] + (چـی: پاشـگری بـکەر؛ پاشگری بە واتای دروستکەر ف پسوند صفت فاعلی)[٢]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:**

١. کەسێک کاروباری ڕاگرتن و بەخێوکردنی ورچە

٢. ورچەوان. ساڵانی زوو ورچەوانی و ڕاگرتنی ورچ بۆ هێندێک کەس، کەسـب و کـار و پیشـە بـوو. کـابرای ورچەوان، زنجیـری دەکـردە لـووتی ورچەکە و دێبەدێ دەیگێـڕا و لە بەرچـاوی خەڵـک هەڵیدەپەڕانـد و کـایەی پێدەکـرد و نمایشـی دەدا و پـووڵی لە بیـنەران وەردەگـرت. بە کـابرای ورچەوانیـان دەکـوت «لـۆتی». ئەو نێونـانە دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەردەمی دەسەڵاتی حکوومەتی تورکەکان لە سەلجووقیان هەتا قاجارەکان.

---

١ ل ١٥٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ ل ٤٠ کتێبی «ایران و ترکان در زمان ساسانیان»، نووسینی عنایەتوڵڵا ڕەزا

# ئاڵتوون

**آلتون** Altûn

١. ئاڵتوونی سەروو: ٦٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣١٠ کەسە.

٢. ئاڵتوونی خواروو: ٥٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٢٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و ماناکەی دەبێتە: زێڕ؛ تەڵا ف طلا

لەم وشەیە بۆ نێوی ژنانیش کەڵک وەردەگرن وەک: ئاڵتوونخانم.

ئەو نێوەیان لە سەردەمی دەسەڵاتی تورکەکان (لە سەلجووقیانەوە هەتا قاجارەکان) لە سەر ئەو دێیە داناوە.



وێنەی ٦. دێی ئاڵتوونی خواروو

# ئارەبۆغڵوو

**عَرَبُغلی** **Areboğlû**

دوو دێ بەم نێوە لە ناوچەی سەرا هەیە:

١. ئارەبۆغڵووی سەروو: ٤٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢١٢ کەسە.

٢. ئاربۆغڵووی خواروو: ٥٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(ئارەب: عەرەب ف عرب) + (ئۆغڵ؛ اوغڵ: کوڕ ف پسر) + (لوو: پاشگری نیسبەت و پێوەندە ف پسوند نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کوڕی ئارەب؛ کوڕی عەرەب ف پسر عرب

# ئاختەپە

**آق‌تپە** **Axtepe**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرای سەقز. ١٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٩ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئاخ؛ آخ؛ ئاق؛ آق: سپی؛ چەرمگ ف سفید) + (تەپە؛ تپە: تەپۆڵک؛ گرد ف تل؛ تپە).

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** گردەسپی؛ تەپۆڵکە سپی ف تپە سفید.

# ئاخکەند

**آخکند** **Axkend**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرای سەقز. ١١٢ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٧٢ کەسە.

**ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:**

ئاخ؛ آخ؛ ئاق؛ آق: سپی؛ چەرمگ ف سفید) + (کەند[1]: دێ؛ ئاوایی؛ گوند ف دە؛ آبادی؛ روستا)

کەوابوو واتای وشەکە دەبێتە: دێسپی؛ دێچەرموو ف دە سفید؛ سپید روستا

---

١ لە زمانی تورکیدا "کەند" بە مانای دێیە. بەڵام هێندێ کەس پێیانوایە ئەم وشەیە پارسیە و چۆتە نێو زمانی تورکییەوە. وشەگەلی وەک (کەیخودا ـ کەدخودا ـ کدخدا) و (کەیبانوو ـ کدبانو) کە بنەڕەتەکەی «کەی ـ کەد ـ کد»ە بە تورکی نازانن. بڕواننە لاپەڕە ٨١ی کتێبی "ایران و ترکان در روزگار ساسانیان". نووسراوی عنایت‌الله رضا.

# ئاڵکەڵوو

آلکلو | Alkelû

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێبی سەقز. ٦٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٢٠ کەسە.

هۆلاکۆ لە لایەن خانیگەورە «مەنگۆقائان»ی برای، بوو بە بەرپرسی ئاسیای ڕۆژئاوایی و لە ساڵی ١٢٥٦ی زایینیدا هاتە ئێران و بوو بە شا و حاکمی ئەم وڵاتە.

هۆلاکۆ و کوڕ و نەوە و بنەماڵەکەی کە لە ساڵی ١٢٥٦ی زایینی هەتا ساڵی ١٣٣٥ی زایینی حوکمی ئێرانیان کردووە و دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە، بە ئێلخانەکان (طایفە ایلخانیان) ناسراو و بەنێوبانگ بوون. شەجەرەنامەی ئێلخانەکان ئاوایە:




شەجەرەنامەی ئێلخانەکان

ل ٣٩٣ کتێبی (تاریخ ایران کمبریج) بەرگی ٥

لە سـەردەمی دەسـەڵاتی ئێلخانەکـان لە هەر شـارێک چـوار ناوەنـدی سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتی هەبوو کە بریتی بوون لە:

١. شارستان و گەڕەکی پیاوماقووڵان و گەورەپیاوان (محلات اعیان و اکابر)

٢. مەدرەسەکان (قوتابخانەکان) یا خوێندنگاکان (مدرسەها)

٣. خانەقـای دەروێشـەکان و ناوەنـدەکانی دیـکەی ئـایینی (خانقاهـای دراویش و دیگر نهادهای دینی)

٤. ناوەندی بازاڕ بە کاروانسەرا و تاجرە گەورەکان و گەرەکی کاسبکار و دووکاندارە چکۆلە وردەفرۆشەکانەوە[١]

ئیبنیبەتووتە (ابنبطوطە) باسی ئەو کاسبکار و دووکاندارانە دەکا و دەڵێ: «هەر دەستە و تاقمێک لەم کاسبکارانە، سەرۆک و کۆنەکار و بەئەزموونێک بۆخۆیان هەڵدەبژێرن و دیاری دەکەن کە پێی دەڵێن "ئێلکولوو؛ الکلو" یا "کەلوی؛ کلوی".

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئێل؛ ایل: تایەفە؛ هۆز؛ بنەماڵە ف طایفە؛ ایل) + (کولو[٢]؛ کلو: نێوبەدەرەوە؛ بەنێوبانگ ف نامدار)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەنێوبانگی ئێل؛ سەرۆک؛ ڕەئیس و ڕیشسپی ف نامدار ایل؛ مشهور؛ رهبر و رئیس

ئەم وشەیە لە سەردەمی ئیلخانەکان لە سەر ئەو دێیە داندراوە و ئاڵوگۆڕێکی زۆر کەمی بە سەر هاتووە و بووە بە ئاڵکەڵوو؛ آلکلو

---

١ ل ٤٨٥ کتێبی (تاریخ ایران کمبریج) بەرگی پێنجەم، کۆکراوەی جی.ئا. بۆیل

٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# ئالّیجان

**Alîcan** **آلیجان**

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی دیواندەرە. ٤٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦٥ کەسە.[١]

یەکەم. ئەم وشەیە تورکییە:

(ئالّیجان: مێهرەبان؛ خوێنشیرین ف دوستداشتنی خونگرم؛ مهربان؛ خوشخو)[٢]

دووەم. وشەی ئالیجان تورکییە و دوو بەشە:

(ئالی: تورکەکان وشەی «عەلی - علی» بەم چەشنە تەفەلوز دەکەن ف تلفظ کلمە «علی» در میان ترکان.) (جان: گیان، ڕوح و ڕەوان ف روان، روح، مایە زندگی)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** عەلی گیان - دەربڕینی خۆشەویستی بۆ عەلی ف علی جان - ابراز عشق و احترام بە علی

---

١ کتێبی جوغرافیای تاریخی کوردستان - جەلال شافعی

٢ فەرهەنگی تورکی - فارسی شاهمەرەسی

# ئایەنان

آدینان Ayenan

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٤٢ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢١٢ کەسە.

**یەکەم**. ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئایە؛ ئایی؛ آیی: ورچ؛ هرچ ف خرس) +

(نان: لەگەڵ؛ دەگەڵ؛ لەتەک ف با؛ همراه)

لە ڕاستیدا ئەم وشەیە و وشەی ئایچی هەردووکیان یەک مانایان هەیە و ئەویش ورچەوان و لۆتییە کە کابرای ورچەوان ورچی زنجیرکراوی دێبەدێ دەگێڕا و نمایشی پێدەدا و پووڵی پێ پەیدا دەکرد.

**دووهەم**. هێندێ کەس پێیان وایە ئەم وشەیە کوردییە: ئاوێنان

(ئاوێنە: جام؛ نەینک؛ ئەو شووشەیەی دەتوانی خۆی تێدا ببینی ف آینە)

بە ڕای من بۆچوونی یەکەم ڕاستترە.

# ئاوباره

آب‌باره **Awbare**

دێـیه‌که سـه‌ر به نـاوچه‌ی چـل‌چه‌مه‌ی دیوانـده‌ره. ٤١ مـاڵه و ژمـاره‌ی دانیشتووانی ٢٢٣ که‌سه.

ئه‌و نێوه کوردییه و دوو واتای هه‌یه:

**یه‌که‌م.** (ئاوبـــاره: داری درێـــژ و ئه‌ســـتوور و هه‌ڵکۆڵـــدراو که بـــۆ په‌ڕاندنه‌وه‌ی ئاو به سه‌ر که‌نده‌ڵانێکدا (که‌نداڵێکدا) ده‌یکێشن و ده‌بێته جۆگه؛ قه‌مته‌ره ف قنطره)

دێیه‌ک به نێوی قه‌مته‌ره له جاده‌ی بورهان له نێوان دوو شـاری مه‌هاباد و بۆکان هه‌یه که ماناکه‌ی هه‌ر ئه‌وه‌یه که له سه‌ره‌وه باسی کرا.

**دووهه‌م.** ئاوباره: هه‌ڵاڵه[1] ـ تۆز یا گه‌رده‌ی گوڵ که هه‌نگ به پێ له سـه‌ر گوڵ هه‌ڵیده‌گرێ و ده‌یباته‌وه بۆ که‌ندوو و له نێو شـانه‌مێودا وه‌ک په‌نیـری کووپه ده‌یئاخنێته‌وه و له کاتی پێویستدا ده‌یخوا تا پرۆتئینی له‌شـی دابین بێ. ف گرده گل که زنبور عسل آن را در خانه‌های شـانه ذخیـره می‌کند و بـه مصرف می‌رساند تا پروتئین بدنش تأمین گردد.

---

[1] فه‌رهه‌نگی هه‌نبانه‌بۆرینه ـ هه‌ژار

# ئیلوو

**ایلو** **îlû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆی سەقز. ٥٧ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٠٩ کەسە.

لە بابەت ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** وشەکە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئیل؛ ایل: ساڵ) + (لوو؛ لو: خاوەن؛ شوێن ف دارندە؛ محل؛ مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەساڵداچوو؛ پیر ف پیر؛ سالخوردە؛ مسن

**دووهەم.** وشەکە تورکییە و دوو بەشە:

(ئیل؛ عێل؛ ایل؛ تایفە؛ عەشیرە ف ایل؛ طایفە؛ قوم) + (لوو؛ لو: خاوەن؛ شوێن ف محل)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنی ئێل و عەشیرە ف محل و مکان ایل

**سێهەم.** وشەکە مەغوولیە:

(ئیل؛ ایل: گوێڕایەڵ؛ گوێلەمست ف مطیع؛ فرمانبردار) + (لوو؛ لو: خاوەن؛ شوێن ف مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێی ئەوانەی گوێڕادێرن ف محل و مکان افراد مطیع و فرمانبردار[1]

١ ل ٢٨٩ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسراوی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

**چوارەم.** لە نێو مەغوولەکاندا بۆ نێوی پیاوان کەڵکی لێ وەردەگرن: وەک:

سەردارێکی هۆزی جەلایر بە نێوی قدان کە هاوڕێی چەنگیزخان بوو، کوڕێکی بوو بە نێوی ئیلووکە (ایلوکە)[1]

**پێنجەم:** وشەکە لە نێو ئاشووری و بابلیەکاندا بە مانای (یەزدان؛ خودا)یە.[2]

---

١ ل ٥٠ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسراوی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

٢ ل ٣٤٨ کتێبی (تاریخ تمدن)، نووسراوی ویل دۆرانت

# ئێراو

**ایراب** **Êraw**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمامی سەقز. ٢٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١١٧ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئێر؛ ئێرا؛ هیرا: فرەوان؛ پان؛ بەرین؛ هەراو ف فراخ؛ وسیع) + (ئاو: آب).

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئاوێکی پان و بەرین و هەراو؛ یانی چۆمێکی گەورە ف آبی وسیع؛ آب فراوان با مجرایی گشاد و بستری وسیع.[١]

قەزوینی لە سەدەی حەوتەمدا نووسیویەتی کە لە ٥٠ کیلۆمێتری شاری بیرجەند ئاواییەکی لێیە کە قەڵایەکی زۆر چاک و باغستانێکی پڕ لە داری هەیە. نێوی ئەو دێیە «ئێراو»ە.[٢]

---

١ فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ ل ٣٨٨ کتێبی «جغرافیای تاریخی سرزمین خلافت شرقی» نووسینی گای لسترنیج.

# ئەیاغچی

آیاغچی　　　　　　　　　　　　**Ayağçî**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٢٩ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١٦٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و بۆ لێکدانەوەی ماناکەی دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** (ئەیاغ؛ ایاغ: کاسە؛ پیاڵەی شەڕابخۆری؛ شەڕاب ف جام؛ پیالەی شراب؛ شراب) + (چی: پاشگری بکەرە؛ پاشگری فاعلییە ف پسوند فاعلی)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** مەیگێڕ؛ ئاوگێڕ ف ساقی؛ سقا

سووتاوە دەروونم وەرن ئەی موتریب و ساقی
تۆ لێ دە لە تەنبوور و ئەتۆش پڕ کە ئەیاغان[1]

**دووەم.** (ئەیاغ؛ اياغ؛ ایاق: پێ؛ پا؛ لاق ف پا) +
(چی: پاشگری بکەرە؛ پاشگری فاعلییە ف پسوند فاعلی)

**مانـای تێکـڕای وشــەکە دەبێـتە:** بەپێـوە؛ بە پـاوە؛ لەسـەرپێ؛ چەرچـی ف دستفروش؛ پیشخدمت؛ فروشندەی دورەگرد[2]

---

١ دیوانی وەفایی

٢ ل ١٤٤ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

**سێهەم**. بۆی هەیە وشەکە کوردی بێ: «ئەیاغ  ـ ئایەخ: خراپ، بەکار نەهاتوو خراب، کهنه، اسقاط» + «چی: نیشانەی فاعیل و بکەر ف علامت فاعل و کننده کار»

که وا بوو مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە: کۆنەفرۆش، سمساری ف کهنه فروش و سمساری

# ئەسحاب

اصحاب Ashab

ئەو دێیە سەر بە ناوچەی کولتەپەی سەقزە. ئێستا چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی.

ئەم وشەیە عەرەبییە و کۆی ساحێبە (صاحب).

ئەسحاب (اصحاب): ١ـ ساحێبان ٢ـ یاران؛ دۆستان

بە یاران و دۆستان و هاوڕێیانی حەزرەتی محەمەد (د.خ) دەڵێن ئەسحابە.

چەند وشە کە بناغەکەیان ئەسحابەیە، بریتین لە:

ئەلف. ئەسحابی شیمال (اصحاب شمال)

ب. ئەسحابی یەمین (اصحاب یمین)

ج. ئەسحابی بیروبۆچوون (اصحاب رأی): بە یاران و هاوڕێیان و ئەسحابی «ئەبوحەنیفە نۆعمان کوڕی سابیت» دەڵێن کە کاتێ لە بابەتی ئەو گیروگرفت و پرسیارانەی تووشی دەبن و دێتە سەر ڕێیان، نووسراوە یا حەدیس و شتی لەو چەشنەیان بە دەستەوە نەبێ، لە ڕاوبۆچوونی خۆیان یان لە «قیاس» کەڵک وەردەگرن.

ساحێب (صاحێب) بە مانای خاوەن و مالکیش هەیە ف خداوند چیزی؛ لە سەردەمی مەغوولەکان بە وەزیریشیان دەگوت ساحێب.

# ئەخزەرئاوا

**Axzerawa** **اخضرآباد**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ٢٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٢٧ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئەخزەر: ١. کەسک؛ سەوز ٢. ئاوی؛ شین ٣. تەڕوتازە ٤. دەریا؛ زریا؛ وشەیەکی عەرەبیە ف ١. سبز ٢. آبی ٣. شاداب؛ تر و تازە ٤. دریا؛ واژەای عربی است) +

(ئاوا: ئاوەدان؛ ئاوەدانکردنەوە؛ دامەزراندن بۆ مانەوە و ژیان ف آباد کردن؛ دایر کردن؛ بنیاد نهادن)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی سەرسەوز و ئاوەدان بێ ف مکان سرسبز و آباد.

دەشکرێ بڵێین پیاوێک بە نێوی (ئەخزەر؛ اخضر) ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە.

دووەم. لە ڕاستیدا ئەم وشەیە بەرئاوەژووی وشەی «ئەسغەر - اصغر»ە کە خەڵکی ڕەشۆکی لە وتن و تەلەفوزدا ئاوای دەخوێننەوە ف گاها عوام کلمه «اصغر» را وارونه و «غ» را قبل از «ص» یا «ز» تلفظ می‌کنند.

کە وا بوو واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە: ئەسغەرئاوا - شوێنێکی «ئەسغەر - اصغر» ئاوەدانی کردبێتەوە ف اصغرآباد - محل و مکانی که توسط اصغر آباد شده است.

---

١ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی عەمید

# ئەحمەد مردی

**أحمد مُرده** **Ahmed mirdî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ٢٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣٨ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئەحمەد: ناوە بۆ پیاوان ف نامی برای مردان) +

(مردێ: مردوو؛ مردگ؛ کەسێکی گیانی دەرچووبێ ف مردە؛ فوتکردە)

**سەرجەمی ماناکەی دەبێتە:** ئەحمەدی مردوو ف احمد مُردە؛ احمد فوتکردە.

وا دیارە لەو شوێنە بۆ یەکەم جار ئەحمەد نێوێک مردبێ و قەبرستانەکەیان بە نێوی ئەوەوە کردبێ و دواتر ئاواییەک لەو دەورە دروست کرابێ.

# ئەولموئمێن

**أبوالمؤمن** **Ewilmûmin**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپە. ٢٥ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١١٦ کەسە.

**یەکەم.** ئەم نێوە عەرەبیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئەو؛ ابو: اب لە عەرەبیدا؛ باب؛ باوک؛ لە سەرەتای نێو دێ و بە مانای باوکە، وەک ابوالحسن؛ یا لە سەرەتای ئاوەڵناو «صفت»دا دێ، وەک: ابوالمفاخر، ابوالفضائل) + (موئمێن؛ مؤمن: بەئیمان؛ دیندار؛ بەبیر و باوەڕ؛ یەکێک لە نێوەکانی خودایە؛ هەروەها نێوی چلەمین سووڕەیە لە قورئانی پیرۆز کە مەکیە و ٨٥ ئایەیە. ف دیندار؛ باایمان؛ از نامهای خداوند؛ نام چهلمین سوره قرآن کریم)

**واتای هەموو وشەکە دەبێتە:** عەبدی دینداران؛ بابی کەسانی بەئیمان

لەوە دەچێ ئەم نێوە پاش سەرکەوتنی سپای ئیسلام و دامەزرانی دەسەڵاتیان لە ناوچەکە بۆ ئەو ئاواییە هەڵبژێردرابێ.

**دووەم.** ئەم وشەیە عەرەبییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئەول: کوردی کراوی وشەی عەبدول ـ عبدل ف تغییر یافته و کردی شده واژه عبدل) + (موئمێن: بەئیمان، ئیماندار، بەبیر و باوەڕ ف مؤمن، باایمان، معتقد)

کە وا بوو **واتای تێکڕای وشەکە** دەبێتە: عەبد و بەندەی بەئیمان و بە بیر و باوەڕ ف عبد و بنده باایمان، عبد مسلمان و مؤمن

وا دیارە لەو شوێنە پیاوچاک و پیر و مورشیدێکی لێ بووە و دێیەکەیان بە نێو و لەقەبی ئەوەوە کردووە.

# ئیسحاق‌ئاوا

**اسحاق‌آباد** **Eshaq awa**

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی بەخشی سەرشیوی سەقز. ٦٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٥٨ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئیسحاق: نێوە بۆ پیاوان؛ نامی است برای مردان) + (ئاوا: ئاوەدان؛ شوێنێکی بە کاری ژیان بێ و ژیانی تێدا بێ؛ آباد؛ محل و مکان زندگی)

**مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی پیاوێک بە نێوی ئیسحاق ئاوەدانی کردبێتەوە؛ مکانی کە بە وسیلەی اسحاق، آباد شده باشد.

بە بڕوای مـن مەبەسـت لەم «ئیسحاق»ە، سوڵتان ئیسحاق (سانسەهاک)ە. ئەم سانسەهاکە لە ساڵی ٦٢٨ی کۆچی مانگی یان ١٢٢٩ی زایینی لە دایکبووە. گۆڕەکەی لە گوندی «شێخان»ی نزیک نەوسوودە. ناوچەکانی هەورامان، جوانڕۆ، گۆران و کێوەکانی دالاهۆ، شوێنی کار و بڵاو کردنەوەی ئایینی ئەهلی حەق بە دەستی سوڵتان ئیسحاق بووە.[1]

ئایینی ئەهلی هەق مێژووی سەرهەڵدانەکەی دەکاتە کۆتایی سالانی سەدەی چوارەمی هیجری (١١٠٠ زایینی) لە کاتی دەسەڵاتداریتی سەلجووقییەکان. لەو سالانەدا موبارەکشای ناسراو بە شاهخوشین لە لوڕستاندا سەری هەڵدا و لە بەشێک لەو وڵاتە برەوی بە ئایینی حەقیقەتدا.

---

١ ل ٨٩ و ٦٣ کتێبی «مێژووی موزیکی کوردی»، محەمەد حەمەباقی

نێوی کتێبی پیرۆزی کاکەییەکان «سەرەنجام»ە. جا چونکە ئەم ئایینە لە کاتی خۆیدا لە زۆر جێگا بڵاو ببۆوە و پەرەی ساندبوو، تیشک و پریشکەکەی ناوچەکانی خورخورە و سەرشیویشی گرتبۆوە. بەڵگەی ئێمە بۆ ئەم وتەیە نێوی چەند ئاوایی لە ناوچەکانی سەر بە سەقزە کە بە بۆنەی هۆگری بەم ئایینەوە نێو نراون:

ـ ئاوایی پارسانیان؛ ئاوایی خوشێنان کە بە نێوی «شاخۆشێن»ەوە کراوە؛ دەرەشێخان بە نێوی ئاوایی شێخانی نزیک نەوسوود شوێنی ناشتنی سوڵتان ئیسحاق کراوە؛ ئاوایی ئیسحاقئاوا کە بە نێوی سانئیسحاق کراوە.[1]

---

١ سەرچاوەی پێشوو

# ئاليار

**آليار** **Alyar**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٢٣ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١١٤ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و دوو مانای هەیە:

**یەکەم**. مانای ئالیار دەبێتە: (کرێ؛ مزە؛ حەقدەست ف مزد؛ کارانه)[1]

**دووهەم**. واتاکەی دەبێتە (مردوو؛ مردگ ف مرده)[2]

وا دیارە یەکەمجار کە تورکەکان ڕێیان کەوتۆتە ئەو ئاوایییە، کەسێک مردووە و خەڵکەکە پێیەوە سەرقاڵ بوون و خەریک بوون بیبەن بۆ قەبران و بینێژن و بەم هۆیەوە ئەوێیان نێو ناوە ئاڵیار یا «مردوو».

سێوەم. وشەکە تورکیە و دوو بەشە: (ئال ـ ئالی: عەلی ـ تەلەفوز و گوتنی وشەی «عەلی» بە زمانی تورکی ف تلفظ علی به زبان ترکی)

مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە: یار و دۆستی عەلی، هەواڵ عەلی، عەلی یار و دۆست ف یار علی، رفیق علی، علیار

چوارەم. ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئالای[3]: مانگی سوور، مانگی وەک زێڕی سوور ف ماه سرخ، ماه به رنگ سرخ در هنگام شفق) + (یار: دۆست، خۆشەویست، هاوڕێ ف دوست، رفیق، همراه)

کە وا بوو مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە: یاری وەک مانگ زێڕین ف یار همچون ماه طلایی

---

١و ٢ و ٣ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# ئینچکه

**اینچکَه** **înçke**

دوو دێ بەو نێوە لە دەوروبەری سەقز هەیە:

١. ئینچکەی سەر بە ناوچەی ئیمام. ٣٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٦٨ کەسە.

٢. ئینچکەی سەر بە ناوچەی تورجان. چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی.

ماکەی نێو یا «وجە تسمیە»ی ئەم وشەیە ئاوایە:

ئینچکە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ئینچ؛ ئینچە؛ ئینجە: چکۆلە؛ بچووک؛ بووچکفکوچک) +

(کە: سواوی وشەی کەند: دێ؛ ئاواییفدە؛ روستا)

**مانای سەرجەمی ئەم وشەیە دەبێتە:** دێی بچووکفروستای کوچک.

# بارام

بَهرام **Baram**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی ســەقز. ٢٦ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٨ کەسە.

ئەم وشەیە کوردی؛ پەهلەوی‌یە.

ئەهوورەمەزدا بۆ ڕاپەڕاندن و جێبەجێ کردنی کار و فەرمانەکانی، دوو دەستە هاوڕێ و یارمەتیدەری هەیە:

**یەکەم.** ئەمشاسپەندان Amshaspendan یا نەمرانی پیرۆز[ف] مقدسـان جاودانی. کە حەوت کەسن و لەگەڵ ئەهوورەمەزدا یەکبیر و باوەڕ، یک وتە و یەک کردەوەیان هەیە.

**دووهەم.** ئیزەدان: ئەوانەش یار و یاوەری ئەهـوورەمەزدان و ژمارەیـان زۆرە، بەڵام هێنـــدێک لەوانە ناســـراوتر و نێـــوبەدەرەوەترن. یەکێـــک لەم یەزدانانە بـارام، بەهـرام یا وەهـرامە کە خـودای سـەرکەوتنە (ایـزد پیـروزی). بارام خراپەکاران تێکدەشکێنێ و لە نێویـان دەبا. دە پەیکەری هەیە یانی بە دە چەشن دەنوێنێ: ١. بای بەهێز ٢. گای گوێزەردی شاخزێڕین ٣. ئەسپی سپی، گوێزەردی لغاو زێڕین ٤. وشتری سەرمەست ٥. بەرازی نێر ٦. لاوی پـازدە سـاڵە ٧. باڵنـدەی بـاز ٨. بەرانـی شـاخدار ٩. بزنەکێـوی شـاختیژ ١٠. شەڕکەری چەکدار.[١] بەم جەستە و پەیکەرانەوە لە بەرانبەر ئەهـوورەمەزدادا

---

١ ل ٣٨ کتێبی (شناخت اساطیر ایران)، نووسراوی جان راسل هینلز ـ وەرگێراوی باجەلان فەرۆخی

دەردەکەوێ. ئەم یەزدانە چەکـــدارترین ئیـــزەدە و لە شـــکڵی "بـــا"دا فەڕە و دەرمـــان و هێـــز بـــۆ خەڵکـــی دێنـــێ. بـــارام لە ئەدەبیـــاتی پەهلەویـــدا لەگەڵ ئەستێرەی مریخ بەرامبەرە.

جـا نێـوی ئەو دێـیە بە نێـوی ئەو یەزدانە (بـارام) کـراوە و وشـــەیەکی کوردی؛ پەهلەوی‌یە.

دەتوانین بڵێین ئەو نێوە نیشـانەی سـەردەمی مەزدەیەسـنایە (زەردەشـتی بـوون) و دەگەڕێـتەوە بـۆ پـێش هـاتنی ئـایینی ئیسـلام. (سـەردەمی حـوکمی مادەکان هەتا کۆتایی حوکمی ساسانیەکان).

# باشبلاغ

**باشبلاغ** **Başbilağ**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٦٥ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٢٩٣ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(باش: سەر؛ سەروو ف سر؛ بالایی) +

(بڵاغ؛ بولاق: کانی؛ چاوە؛ هانی ف چشمە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی سەروو ف چشمە بالایی

ئەم دێیە بە نێوی ئەو کانییە کراوە کە لە سەرووی دێ هەڵکەوتووە.

# باشماغ

**Başmağ** باشْماق

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ١٦٤ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٦٥ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە:

١. مانای یەکەم: کەوش؛ پێڵاو ف کفش؛ پاپوش

٢. مانای دووهەم: گۆشتی گوێلک؛ گۆشتی گوێرەکە ف گوشت گوساله

٣. مانای سێهەم: ئەو دەسماڵەی ژنان بە سەریدا دەدەن ف دستمالی که زنان بر سر بندند.[1]

لەو وشەیە بۆ نێوی پیاوان لە نێو مەغوولاندا کەڵک وەردەگیرێ وەک:

(چەنگیزخان ←جووچی ← ئووردە ← قوولی ← مینگقان ← بەشماق)[2]

زۆر ئاوایی دیکەش هەیە بەم نێوە وەک:

* دێی باشماق لە شاری هەشتەرۆی ئازەربایجانی ڕۆژهەڵاتی

* دێی باشماغ لە شاری مەریوان کە شوێنێکی سنووری نێوان کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراقە.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ ل ٥١٠ کتێبی (جامع التواریخ) ـ ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا.

# باغڵووجە

**باغلوجه** **Bağlûce**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٧٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٧٨ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(باغ؛ باخ: شوێنێکی داری لێیە؛ دارستانی میوە ف جمع درختان میوه؛ باغ)+

(ڵوو؛ لوو؛ لو: پاشگرە بە مانای خاوەن؛ شوێن ف محل؛ مکان؛ دارنده) +

(جە: چکۆلە؛ نیشانەی بووچک کردنەوە ف نشان کوچک کردن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** باغ و دارستانی چکۆلە ف باغ کوچک؛ باغچه

بەم نێوە زۆر دێ هەیە:

* دێی باغڵووجە سەر بە شاری خودابەندەی زەنجان.
* دێی باغڵووجەی سەردار سەر بە شاری نیکپەی زەنجان.
* دێی باغڵووجەی بەیات سەر بە شاری زەنجان.

# باڵووقایە

**بالوقایە** **Balûqaye**

کێوێکە لە نزیک دێی ئەحمەداوای سەرای سەقز.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(باڵ: هەنگوین ف عسل، انگبین) + (ڵوو، لو: شوێن، جێ، خاوەن ف محل، مکان، دارندە) + (قایە؛ قەیە: گاشە بەرد؛ تەلەسەنگ ف تختە سنگ)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو کێوەی هەنگوینی هەیە؛ مەبەست ئەو کێوەیە هێلانەی هەنگی لێیە و هەنگوینی تێدایە ف کوهی کە عسل دارد.

**دووهەم.** وشەکە کوردی؛ تورکییە:

(باڵوو؛ پاڵوو؛ پاڵ: شان؛ تەنیشت ف کنار؛ پهلو) +

(قایە؛ قایا؛ گاشە بەرد؛ تەلەسەنگ ف تختە سنگ؛ کوە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەردی پاڵ دێ؛ بەردی نزیک دێ ف سنگ و کوە کنار دە.

وشەی قایە لە بنەڕەتدا تورکییە. لە زمانی تورکیدا بێجگە لە «داش: بەرد ف سنگ» لە وشەی «قایە؛ قیە»ش کەڵک وەردەگیرێ. بە بڕوای من ئەو وشەیە لە دوای هاتنی تورکەکان بۆ ئێران لە سەدەی یازدەی زایینی و بە تایبەت بۆ کوردستان پەڕیوەتە نێو زمانی کوردی و لەگەڵ وشەگەلی کوردی تێکەڵاو بووە و نێوێکی تازەی پێکهێناوە. بۆ وێنە:

* کێوی قەرەقا لە دوو بەش پێکهاتووە: (قەرە؛ قەرا: ڕەش ف سیاه) + قا؛ قایە: گاشەبەرد ف سنگ)

مانای وشەکە: بەردەڕەش ف سیاەسنگ

ئەو کێوە لە نزیک دێی کانیدرێژی بۆکان هەڵکەوتووە.

* کێوی قلیجقایە: کێوێکە لە نزیک دێی ساروقامیشی فەیزوڵلابەگی بۆکان هەڵکەوتووە.

وشەکە تورکییە: (قلیچ؛ قلیج؛ قیلینج: شمشێر؛ خەنجەر ف شمشیر؛ خنجر)+ (قایە: تەلەسەنگ؛ تەختەسنگ ف تختەسنگ؛ سنگ بزرگ)

**مانای تێکڕای وشەکە:** بەردەشەمشێر ف شمشیر سنگی.

* کەلـی زەرقە (ف گـردنە زرقە): ئەو مـلەیە لە نێـوان دوو دێـی خوردەلووکی و کەچەڵمینگان"ی سەرشیوی سەقز هەڵکەوتووە.

وشەکە کوردی؛ تورکییە:

(زر؛ زەر؛ زەرد؛ زێڕ ف زرد؛ زر؛ طلا) +

(قە؛ قا؛ قایە: گاشەبەرد؛ تەلەسەنگ ف لاشەسنگ؛ تختەسنگ)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەردەزەرد بەردەزێڕ ف زردسنگ؛ زردکوە؛ طلاسنگ، سنگ زرین.

* کێـوی "سـاریقەیە". وشـەیەکی تورکییـە: ئەو کێـوە لە دەوروبەری شاری زەنجان هەڵکەوتووە:

(ساری: زەرد ف زرد) + (قەیە؛ قایا: تەلەسەنگ ف تختەسنگ)

مانای وشەکە دەبێتە: بەردەزەرد ف زردسنگ؛ زردکوە

* کێوی (ئـاغجەقەیە) لە نزیـک شـاری بەهـاری هەمەدان هەڵکەوتـووە. وشەکە تورکییە:

(ئاغ؛ ئاق؛ آق: سپی؛ چەرمگ ف سفید) +

(جه: چکۆله؛ بووچک؛ گچکه ف کوچک؛ نشانه تصغیر در زبان ترکی)

مانای وشەکە دەبێتە: بەردی سپی چکۆلە ف سنگ کوچک سفید.

* دێی قاییبەرد. دێیەکی شاری بانەیە. وشەکە تورکییە:

(قایی: قایم؛ موحکەم؛ سەخت ف محکم؛ استوار) +

(بەرد: سەنگ؛ کوچک ف سنگ)

مانای وشەکە: بەردی سەخت؛ سەختەبەرد ف سنگ سفت و محکم)

* چەند نێوی دیکە وەک:

ـ جوداقەیە (جداقیە): وشەیەکی کوردی؛ تورکییە. کێو و دێیەکە نزیک شاری قوروە.

ـ کەسلانقەیە (کسلانقیە): وشەیەکی تورکییە. کێوێکە لە دەوروبەری شاری قوروە.

ـ قەڵەشقەیە (قلشقیە): وشەیەکی کوردی؛ تورکییە. کێوێکە لە سەر ڕێگای بیجار؛ زەنجان.



وێنەی ٧ـ کێوی باڵووقایە و دێی ئەحمەدئاوا

# باڵەقڵوو

**بالاقُلو** **Balequlû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ١٧ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٨٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

**یەکەم.** (باڵە؛ بالا: چکۆلە؛ گچکە؛ بووچک ف کوچک؛ ریز) +

(قڵوو؛ قولو؛ قولی: ناوە بۆ پیاوان بە واتای غولام لە نێو تورک و مەغوولدا ف قلی نامی برای مردان)[١]

مانای وشەکە دەبێتە: قولیە چکۆل ف قلی کوچولو

**دووهەم.** (باڵە؛ بالا: چکۆلە؛ بووچک ف کوچک؛ ڕیز) +

(قڵوو؛ قولی؛ قول: نۆکەر؛ پێشخزمەت؛ غولام ف غلام؛ نوکر؛ بندە)[٢]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** غولامەچکۆڵ؛ نۆکەرە چکۆلەکە ف غلام کوچک؛ نوکر کوچولو

---

١و ٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# باییەر

**بایدَر** **Bayier**

دوو دێ بەو نێوە لە ناوچەی چلچەمەی (چهلچشمه) سەرشیوی سەقز هەیە کە هەردووکیان چۆڵن و ئاوەدان نین: باییەری سەروو، باییەری خواروو.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(با؛ با ف باد) + (ییەر؛ دەر؛ دەرە؛ تێیدا ف در؛ در آن؛ داخل آن، دره)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێیەکی بای پێدادێ؛ دۆڵ و دەرەی باگر؛ شوێنی باگر ف جایی کە در آن باد می‌وزد؛ محل عبور باد؛ محلی کە بادگیر است.

لەم وێنەیە وشەی ئاویەر هەیە کە کێوێکی بەرزە و لە پەنای شاری سنە هەڵکەوتووە.

مانای ئاویەر یا آبیدر: شوێنێکە ئاوی پێدادێ؛ دەراوی ئاو ف محلی کە در آن آب جاری است.

# بست

**بْست** **Bist**

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی دیواندەرە. ٧٧ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤١٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و چەند واتای هەیە:

١. بست: بسفوجب

٢. بست: بستە؛ ئاسنی نێوان تەوەرە و بەرداش؛ بستی ئاش؛ بستووف قطب آسیاب

٣. بست؛ بستوو: ملەی کێوفگردنەی کوە[1]

بە گوێرەی ئەو باسانەی لە کتێبی مێژووی ماددا هاتووە (لاپەڕە ١٥٧ و ١٩٢)، ئەو ئاواییە زۆر کۆنە و لە هێرشەکانی ئاشوور بۆ سەر دەوڵەتیماننا چەند جار باسی کراوە (ساڵی ٧٧٥ بەر لە زایین).

لەو سەردەمەدا نێوی بست (بوشتو؛ بوستوس) بووە. بوشتۆ قەڵایەکی گرینگ بووە کە لە ڕووی گرینگایەتی، شانی لە شانی «ئیزرتا؛ ایزرتا» پایتەختی ماننا داوە و لە سنووری ماننا و پارسوا هەڵکەوتووە و لە سەدەکانی هەشت و حەوتی بەر لە زایین سەر بە دەوڵەتی ماننا و بەشێ لە خاکی ئەو وڵاتە بووە.[2]

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ ل ٤٩٤، تاریخ ماد، ا.م. دیاکۆنۆف

کەوابوو مانای بست: بستوویە و ئەویش بە مانای ملەی کێو یا (گردنەی کوە)ە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەم دێیە لە شانی کێوی چلچەمە هەڵکەوتووە، دەتوانین بڵێین مەبەست لە ملەی کێو، هەر کێوی چلچەمەیە.

مامۆستا **محەمەد نووری** شێعرێکی هەیە وشەی بستووی تێدا هاتووە:

لە سەر بستووی ژیان وەک داری چاکی
بە تەنیا ماومەوە، بێبەرگ و بێبەر

# بناوەچان

**بناوَچان** **Bnaweçan**

ئەو دێیە سەر بە ناوچەی چلچەمەی دیواندەرەیە. ٥٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٨٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە:

(بناوەچ: داری بناو؛ دارێکی بێبەرە؛ دارێکە لە بنەماڵەی زەیتوون. گەڵاکانی وەک گەڵای بادام وان کە بۆ دەوا و دەرمان کەڵکی لێوەردەگیرێ. ف درخت زبانگنجشک؛ از درختان بی‌بر و از خانوادەی زیتون. برگهایی شبیه برگ درخت بادام دارد. مرغزبانک) +

(ان: پاشگری کۆیە ف پسوند و علامت جمع)

وا دیارە ئەو دێیە داری بناوەچی زۆر بووە و بەم هۆیەوە ناوی بناوەچانیان لە سەر داناوە یانی دێی داری بناوەچەکان.

مانای وشەکە دەبێتە: دارەکانی بناوەچ؛ دارە بناوەچەکان ف درختان زبانگنجشک

# بۆخەڵوو

بوخلو                                                  Boxelû

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی چـلچەمەی سەرشـیوی سـەقز. ٤١ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٥٢ کەسە.

ئەم وشەیە مەغوولیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بۆخە؛ بوخە؛ بوغە؛ بوغۆ[١]: چەشنێ مانگایە ف نوعی و یا نژادی از گاو)

+

(ڵوو؛ لوو: خاوەن؛ شوێن؛ جێ؛ لە تورکی و مەغوولیدا پاشگرە ف پسوند به معنی دارنده؛ محل؛ جا)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شوێن و جێگایەی مانگای بوغەی لێیە ف محل و مکانی که دارای گاوی موسوم به بوغه یا بۆغۆ می‌باشد.

ئێسـتاش لە نـاوچەی موکریـان بە گـای قەڵەو و زل و سـەرکێش دەڵـێن گای بوغە.

لە بـابەت گـۆڕینی دوو پیتـی خ و غ دەبـێ بڵێـین ئەم کـارە لە زمـانی کوردیدا ئاساییە وەک: باغ ← باخ

---

١ ل ٥٨، کتێبی «نظام اجتماعی مغول»، تسۆف، وەرگێڕانی شیرین بەیانی

# بوغدەکەندی

**بُغدەکندی** **Buğdekendî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٨٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٥٦ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(بوغدە؛ بوغدا؛ بُغدە: گەنم[ف]گندم) +

(کەند؛ کَند: دێ؛ گوند؛ ئاوایی[ف]دە؛ روستا؛ آبادی) +

(ی: یای نیسبەت؛ یای پەیوەند[ف]یای نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دێی گەنم؛ دێیەکی گەنمی زۆر بێ[ف]دە گندم؛ آبادی کە گندم فراوانی داشتە باشد.

# بۆگەبەسی

**بیگ‌اویسی** **Bogebesî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٧١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٣٦ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە بنەڕەتدا «بەیگئۆبەسی؛ بیگ‌اوبَسی» بووە کە بەرەبەرە ئاڵوگۆڕی بە سەردا هاتووە و بووە بە «بۆگەبەسی».

وشەکە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(بەیگ؛ بەگ: ئاغا؛ میر؛ خان[ف] بیگ؛ خان؛ آقا) +

(ئۆبە؛ اوبە: خێوەت؛ خێمە؛ چادر؛ شوێنی دامەزران و حاوانەوەی ئێل و هۆزەکان[ف] چادر؛ خیمه؛ محل اقامت و سکونت قبیله‌ها) +

(سی: پاشگری نیسبەتە[ف] پسوند نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** چیغ و چادری خان؛ خێوەت و ڕەشماڵی ئاغا؛ شوێنی دامەزران و حاوانەوەی بنەماڵە و هۆزی خان[ف] چادر و خیمه و محل اقامت و سکونت ایل و خانوادەی خان.

هێندێک کەس پێیان‌وایە وشەی بۆگەبەسی بناغەکەی «بوغ؛ بوگ "بُـغ"»ە کە بە مانای خودا و یەزدانە. ئەم بۆچوونە هەڵەیە.

# بۆبوکتان

بوبُکتان **Boboktan**

ئەم دێیە سەر بە ناوچەی تەمۆغەیە. ٧١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٦٥ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(بو: ئەوە؛ ئەمە|ف| این) + (بوکت: سەد و بەندێکی بەری ئاو دەگرێ؛ بناوانێکی لەبەر ئاو هەڵیدەبەستن|ف| سد و بندی کە پیش نهر آب بندند)[1] + (ان: نیشانەی فاعیل یا بکەرە|ف| علامت صفت فاعلی)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەم پیاوەی بەند دروست دەکا؛ ئەم پیاوەی بەند هەڵدەبەستێ؛ ئەم بەندەوانە|ف| این مرد کە بندآب می‌سازد؛ این سدبان؛ این سدساز.

دەبێ هۆی ئەم نێونانە ئەوە بێ: یەکەم جار کە سپاییە تورکەکان چوونەتە نێو ئەو ئاواییە، پیاوێکیان دیوە خەریکی هەڵبەستنی بناوانە و هەر لەبەر ئەمە پێیان گوتووە ئەو پیاوەی بەند هەڵدەبەستێ.

دووەم. وشەیەکی تورکییە و سێ بەشە:

(بۆ: بەو، بەگ، ئاغا، خان|ف| بیگ، آقا، خان) + (بوکت: بناوان، سەد، هەڵبەستنی بەند و بەریانی ئاو|ف| سد، بند، جلو آب را گرفتن) + (ان: نیشانەی شوێن و جێ؛ پاشبەندێکە بە دوای جێگاوە دەنووسێ[2]|ف| پسوند مکان)

کە وا بوو مانای تێکڕای وشەی بۆبوکتان دەبێتە: شوێن و جێی بناوانی خان؛ جێگای بەند و سەدی ئاغا و بەگ|ف| محل و مکان سد و آب‌بند خان

---

١ ل ٣٤٩، فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ فەرهەنگی کوردی، عەبدوڕەحمانی زەبیحی

# بۆردەمە

بوردَمَه Bordeme

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی سەرشیوی سەقز. ئێستا چۆڵ کراوە و کەسی تێدا ناژی.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بۆر + ڕەنگی خۆڵەمێشی؛ یەکسمی پنۆک پنۆکی ڕەش و سپی ف رنگ خاکستری؛ اسب خاکستری با لکەی سفید) +

(دەمە: ١ـ کزەبای ساردی سەرکێوان لە زستاندا کە بە بەفرەوە بەرز ئەبێتەوە ٢ـ لێوی تیغ ٣ـ دەمنە؛ مۆدنە ٤ـ دەمەی ئاسنگەری ف ١ـ باد سرد کوهستان در زمستان ٢ـ لبەی تیغ ٣ـ چوب سیگار ٤ـ دمەی آهنگری)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ڕەشەبا؛ باوبۆران؛ دەمەی وەک بۆران ف باد سیاه؛ باد و بوران

دیارە مەبەست لەو نێونانە ئەوەیە ئەم ئاواییە لە جێ و شوێنێک هەڵکەوتووە باگرە و بای بەهێز و سارد لەوێوە تێدەپەڕێ.

ئەم وشەیە لە شیعرێکی شاعیری گەورە، مەولەوی تاوەگۆزیدا دەبیندرێ:

خەیاڵان خام هاوردم بەردم
هاوار جە دەمەی هەناسەی سەردم

**دووەم.** بە کوڕە لاوێکی تازە سمێڵی هاتووە و سمێڵی بۆر بووە، دەڵێن بۆرەدەم یا دەمبۆر.

# بەستام

بَسطام Bestam

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی سەرشیوی سەقز. ١٠٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥١٩ کەسە.

بەستام دووهەمین شاری وڵات یا پارێزگای (قومس: دامغان) لە ڕوانگەی پان و بەرینییەوە بووە. ناسرخوسرەوی شاعیر لە ساڵی ٤٣٨ی ک.م ئەم شارەی دیوە و دەڵێ ناوەندی ئوستانی قومس بووە. سۆفی گەورە و بەناوبانگ بایزیدی بەستامی لەو شارە نێژراوە و قەبرەکەی لەوێیە.

ئەم گوندەیان بە نێوی ئەو شارە گەورەیەوە کردووە.

# بەرچەم

بَرچَم **Berçem**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ٣١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٥٣ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەر: پێشەوە، ڕووەکەی ف پیش، جلو) + (چەم: چۆم، ڕووبار ف رود، رودبار)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ئاواییەکی بەرەکەی چۆمی لێیە؛ دێیەکی پێشەکەی چۆمی پێدا بڕوا ف روستایی که جلو آن رودخانه جاری است؛ دهی که در جلو آن رود جاری باشد.

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەر: پێش، ڕوو ف پیش، جلو، روبرو) + (چەم: چاو، دیدە ف چشم)

واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە: بەرچاو، بەردیدە، لە پێش چاو ف جلو چشم، جلو دید

مەبەست ئەوەیە ئەم گوندە لە بەرچاوە؛ لە پێش چاوە؛ شاردراوە نییە ف منظور آن است روستا در پیش چشم قرار دارد و گم و ناپیدا نیست.

**سێهەم.** ئەم وشەیە کوردییە: (بەر: پێش، ڕوو ف پیش، جلو) + (چەم: مێشەڵان ف بیشە، بیشەزار)

واتای سەرجەمی وشەی بەرچەم دەبێتە: بەری دێیەکە مێشەڵانە؛ بەردێ دار و مێشە بووە ف جلو روستا بیشەزار بودە است.

# بەوراوا

**بدرآباد** **Bewrawa**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٢٩ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٦٧ کەسە.

**یەکەم**. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەور؛ بەفر ف برف) + (ئاوا؛ ئاوەدان؛ جێی ژیان ف آباد)[١]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دێیەکی بەفر ئاوەدانی کردۆتەوە ف دهی آباد از برف فراوان؛ برف‌آباد.

لە شاری قوروە ناوچەیەک بەم نێوە هەیە کە لە ١٠ دێ پێکهاتووە. وشەی بەور نێوی لووتکەی کێوێکە لە زنجیرەکێوەکانی کوردستان. خەڵکی ناوچەکە پێی دەڵێن بەور یانی (بەفر). چون زۆرتری ساڵ لووتکەی ئەم کێوە بەفر گرتوویە و پێوەی دەمێنێ. بەڵام فارسی‌زمانەکان پێی دەڵێن «بەدر».

**دووهەم**. وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەور؛ بەبر ف ببر) + (ئاوا؛ ئاوەدان؛ جێی ژین ف آباد)

مانای وشەکە: بەور یا حەیوانی بەبر ئاوەدانی کردۆتەوە؛ یا جێیەکە پڕ لە بەبر ف ببر آنجا را آباد کرده است؛ شاید منظور آن است که ده مذکور ببر دارد.

یا مەبەست پیاوێکی ئازای وەک بەبر ئەو دێیەی دروست کردووە.

---

١ ل ٨٠٧ کتیبی «جوغرافیای تاریخی کوردستان»، مەلاجەلال شافعی

بەو نێوە شوێن و هۆزیش بووە. وەک:

ـ بلازەڕی مێژوونووسی عەرەب دەڵێ: براء بن عازەب کە قەزوینی گرت بە فەرمانی حەزرەتی عومەر خەلیفەی مسوڵمانەکان بە پەلە و بێڕاوەستان چوو بۆ دەیلەمان و جیلان و بەبر و تالشان.[1]

ـ لە زنجیرە کێوەکانی ئەلبورز هۆزێکی لێبووە بە نێوی بەبر (ببر) کە ئێستا نیشانەیەکی لێ نەماوە.[2]

---

١ ل ٢٦ و ٣١ کتێبی «شهریاران گمنام»، نووسینی ئەحمەد کەسرەوی

٢ سەرچاوەی پێشوو.

# بەلەجەڕ

بَلَه‌جر **Belecer**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ٨٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٩٢ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی مانای ئەم وشەیە، چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەلە: بلە، کورتکراوەی نێوی ئیبراهیم لە نێو کورداندا ف کوتاه شدەی واژەی ابراهیم) + (جەڕ: جاڕ؛ پەرێز: جێگەی دەغڵی دروێنەکراو؛ شوێنی گیایەکی تایبەتی ف زمین درو شدە و شخم نخوردە)

کەوابوو مانای وشەی بەلەجەڕ دەبێتە: جاڕی بلە؛ جاڕی ئیبراهیم ف زمین و دشت ابراهیم.

وا دیارە هۆی نێونانی ئەو دێیە ئەوە بووە کە یەکەم جار پیاوێک بە نێوی ئیبراهیم ئاوەدانی کردۆتەوە ف ظاهرا دلیل نامگذاری آن بودە کە شخصی بە نام ابراهیم روستا را بنیان نهادە و آباد نمودە است.

**دووهەم**. وشەی بەلەجەڕ تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(بەلە: بەڵە؛ باڵا: چکۆلە؛ ورد؛ بووچک؛ گچکە ف ریز؛ خرد؛ کوچک) + (جەڕ: بناوان؛ بەند؛ سەدی چکۆلە ف آب‌بند؛ سد کوچک؛ جر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بناوانی چکۆلە؛ بەندی چکۆلە؛ سەدی چکۆلە ف آب‌بند و سد کوچک

به هـۆی ئەوەی دێـی بەلەجەڕ لە نزیـک چـۆمی سـەقز هەڵکەوتـووە و چۆمێکی چکۆلە و وەرزیش بە نێو دێدا تێدەپەڕێ، بۆی هەیە لە کاتی خۆی خەڵکی دێیەکە کە بناوانیان لە سەر ئەو چۆمانە هەڵبەستبێ و تورکەکان بەم بۆنەیەوە نێویان نابێ بەندە چکۆلەکە.

ـــ وشـــەی جەڕ کە مانـــاکەی بنـــاوان و بەنـــداوە، لە نێـــوی ئـــاوایی «تاڵەجەڕ»یشدا دەبیندرێ.

# پارسانیان

**پارسانیان** **Parsanyan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ٦٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٣٢ کەسە. لەو نووسراوە و کتێبانەی پێوەندییان لەگەڵ زەردەشتیەکان هەبێ، لە جیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ لە وشەی «زەردەشتی و زەردەشتیەکان» کەڵک وەرگیرێ، وشەگەلی «پارس و پارسیان» دەنووسرێن و بەکار دەهێنرێن. وەک:

ــ لە نێو پادشایانی کۆن و باستانی و پاڵەوانانی ئەفسانەیی، تەنیا «جەم»ە لە «گاهان» (گاسەکان) کۆنترین بەشی کتێبی پیرۆزی پارسیەکاندا «زەردەشتیەکان» باسی کراوە و نێوی بردراوە.[1]

ـ لە چیرۆکی سەفەری «جەم» بۆ بارەگا و تەختی یەزدان لە ئاسمان و نیشتنەوەی لە سەر کێوی ئەلبورز ڕەنگە نەریتێکی پارسی «زەردەشتی»مان بە دەستەوە بێ.[2]

ـ ئەو بڕگەیەش نووسراوی محەمەدئەمین هەورامانی باسی بابەتەکەی کردووە: پاش ئەوەی کە سەرپاکی کوردستان هاتە سەر ئاییینی ئیسلام، پارسانیەکان کە سانئیسحاق نوێکەرەوەیەتی و هەندێ خەڵکی ناوچەی هەورامان، کە لە ناوچە شاخاوییەکانی هەوراماندا، لە سەر ئاییینی زەرتوشت

---

١ ل ٢٩٧ و ٣٧٦ کتێبی «نخستین انسان و نخستین شهریار»، ئارتور کریستیان سێن، وەرگێڕ ژاڵە ئاموزگار و ئەحمەد تەفەزولی.

٢ سەرچاوەی پێشوو.

مابوونەوە، بە پێی ئەو ئاڵوگۆڕەش کە دەنگی «ب» و دەنگی «و» جێگۆڕکێ دەکەن، بۆیە وشەی گەور بەرەو گۆڕ ڕۆیشت و کۆیەکەشی بوو بە گۆران و ئەمەش هەمیشە بەو خەڵکە دەوترا کە لە ناوچە شاخاوییە دوورەدەستەکانی هەورامان دەژیان و بە ڕواڵەت ئیسلام بوون بەڵام لە دڵ و دەروونندا یان کاکەیی «پارسانی» یان «زەرتوشتی» بوون.[1]

پێموایە نێوی ئەو دێیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پاش هاتنی ئیسلام و مانەوە و خۆڕاگری خەڵکی ئاواییەکە لەسەر بیر و باوەڕی مەزدەیەسنا. جا بۆیە پێیان گوتوون پارسانیان یا خەڵکی زەرتوشتی.

وشەکە (کوردی؛ پەهلەوی)یە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(پارس: زەرتوشتی + ان: نیشانەی کۆف علامت جمع + یان: پاشگری نیسبەت و پێوەندەف پسوند نسبت)

کەوابوو مانای وشەی پارسانیان دەبێتە: زەرتوشتیەکانف زردشتیها.

---

١ ل ٨٩ و ٩٠ کتێبی «مێژووی موزیکی کوردی»، محەمەد حەمەباقی

# پەچەسوور

پَچَەسور                                                    Peçesûr

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٧ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٣٦ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(پەچە: ڕووبەندی ژنـان ف روبند زنانـه) + (سـوور: ڕەنگی ئـاڵ؛ قرمـز ف سرخ؛ قرمز)[1]

مانای وشەکە: ڕووپۆش و ڕووبەندی سووری ژنانە ف روبند قرمز زنانه

**دووهەم.** وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(پەچە: جـێخەوی مـێگەلەمەڕ لە دەشـت ف جـای خـواب گوسـفندان در دشت) + سوور: ئاڵ؛ ڕەنگی قرمز ف سرخ؛ قرمز)[2]

مانـای وشـەکە: شـوێنی ڕاگـرتن و حەسـانەوەی ئـاژەڵ لە دەشـتدا کە خۆڵەکەی سوورە. ف محل نگهداری و استراحت گوسفندان در دشت که خـاک آن رُسی و سرخ رنگ است.

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ سەرچاوەی پێشوو.

# پیرئۆمەران

**پیرعمران** **Pîromeran**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ٨٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٦٢ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(پیــر: شــێخی تەریــقەت، ڕێــبەر و ڕێنمــوونی ڕێگــای هەق، ڕێــبەر و مورشـیدی تەواو ف مرشـد کامـل، مرشـد و راهنمـای تصـوف، رهبـر، شـیخ طریقت)

لە کوردەواریـدا بە وەچە و هەمـوو ئەو کەسـانەی بە چەشـنێ دەبـوونە «ئەولادی پێغەمبەر» دەگوترا شێخ. ئەوانەشـیان وا لە نزیکی وڵاتی فارسـدا بـوون «مەبەسـت ئێرانە»، لە جیـاتی شـێخ، ناوبـانگی «سـەید»یـان دەرکـرد. زۆریشیان پێیان ئەوترا «پیر». وەک پیر خدر، پیر یۆنس، پیر چۆپان.[1]

+ (ئۆمەر: سـواو و کـوردیکراوی وشـەی عـومەرە. نێوە بـۆ پیـاوان. ف کردی شده واژه «عمر»، نامی است برای مردان)

وەک حــاجی ئــۆمەران «حــاجی عمــران» لە ســنووری پیرانشـــار و کوردستانی عێراق. هەروەها دێی لالۆمەرە لە کوردستان.

---

١ ل ٣٣ کتێبـی «چەمکێکـی مێـژووی هەورامـان و مەریـوان» نووسـراوی سـەید عەبدوسـەمەدی تووداری، وەرگێڕ محەمەدی مەلا کەریم

وشەی «ئۆمەر» لە سەر زاری خەڵک و لە بەندوباوی کۆندا زۆرتر لە وشەی «عومەر» باو بووە: مام ئۆمەرەی بنکەندی، بە خۆت و بە توڵەقەندی، کەوڵی ڕێویت بە چەندی؟

+ (ان: پاشبەندی جێیە، بە دوای جێگاوە دەنووسێ[١] ف پسوند مکان و محل) وەک ئێران، کێوی بەرانان، سیدەکان، لەندی شێخان، ترشەکان.

**کەوابوو واتای پیرئۆمەران دەبێتە:** شوێن و جێگای پیرعومەر ف محل استقرار شیخ عمر

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە و سێ بەشە:

(پیر: شێخ و ڕێبەر و مورشیدی تەریقەت ف مرشد کامل، رهبر و شیخ طریقت) + (ئۆمەر: کوردی کراوی وشەی عومەر ف کردی شده واژەی عمر) + (ان: ئەلف و نوونی ئەبوەت «اُبُوَّت» یا ئەلف و نوونی باوک و فرزەندییە ف الف و نون پدر و پسر یا ابوت است.) وەک: قوبادان: کوڕی قوباد؛ کاوسان: کوڕی کاوس؛ بابەکان: کوڕی بابەک

لەم چەشنە نێوانە بێجگە لە پیرئۆمەران، نێوی دیکەش هەیە:

حەسەن سالاران، حاجی مەمەدان، هەمزەقەرەنیان، ڕۆستەمان.

**کەوابوو لێرەدا واتای ئەم وشەیە دەبێتە:** شوێن و جێگای کوڕی شێخ ئۆمەر، شوێنی ژیانی کوڕی شێخ عومەر ف محل و مکان زندگی پسر شیخ عمر

هەرلەم بوارەدا: یەکەمین کەس کە لە نێو کورددا لە جیاتی شێخ، پێی گوتراوە «پیر»، نێوی شێخ محەمەد زەهیرەدین ناسراو بە «پیرخدر یا پیرخضر»ی شاهۆ بووە.[٢] ئەو پیاوە لە مەدینەوە هاتۆتە نێو کوردان و وڵاتی

---

١ قامووسی زمانی کوردی، عەبدوڕەحمان زەبیحی، بەرگی یەکەم

٢ ل ٣٣ کتێبی «چەمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان» نووسراوی سەید عەبدوسەمەدی تووداری، وەرگێڕ محەمەدی مەلاکەریم

کوردەواری. تا پیرخدر خۆی مابوو، دێیەکەی هەر نێوی «قوتڵوغئاوا» بوو. لە ڕۆژی مردنی پیرخدردا، خودا کوڕێکی پێ دا کە نێویان نا «محەمەد» و لەقەبی «پیرخدران»یان دایە. دێیەکەش کە نێوی قوتڵووغئاوا بوو، لەوەوە نێویان نا «پیرخدران» کەواتە «ئەلف و نوونەکەی هی تَثنیەیە.

لێرەدا ئاماژە بە نێوی چەند ئاوایی دەکەم کە سەرەتاکەیان وشەی «پیر»ە:

پیریۆنس (سەقز)، پیر سەفا (مەریوان)، پیرمیقدار (کامیاران)، پیرتاج (بیجار)، پیربادین (بۆکان)، پیرمەولوود (بەهاری هەمەدان)

**سێهەم.** وشەکەیە لە دوو بەش ساز کراوە:

(پیر: ڕێبەر و مورشیدی تەریقەت، شێخ ف شێخ و راهنمای طریقت) + (ئۆمەران ـ عومران: ئاوەدان کردنەوە ف عمران، آبادانی، آباد کردن)

**کەوابوو لەم ڕوانگەیەوە واتاکەی دەبێتە:** شێخ ئەم شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە ف شیخ این محل را آباد نموده و کار عمرانی انجام داده است.

# تاڵەجەڕ

**تالَەجَر** **Talejer**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ٤٨ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٥٠ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم نێوە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تـاڵە: ١ـ ڕەشـی خۆڵەمێشی؛ ڕەشـی کەوە ٢ـ جۆرێ هەرزن ٣ـ مـرۆر؛ دەنکێکی تـاڵ لە نـاو گەنمدا ٤ـ مەڕ یـا پەزی سـپی دەم و چـاوبۆر ٥ـ گیـای تـاڵوو ٦ـ بێفەڕ و شـووم ف ١ـ سـیاه مایـل بە خاکسـتری ٢ـ نـوعی ارزن ٣ـ دانەای تلخ در میان گندم ٤ـ گوسفند سفید سر و صـورت خاکسـتری ٥ـ گیـاه تالک ٦ـ شوم، نحس)[1] + (جەڕ؛ جاڕ: ١ـ پەرێز؛ جێگەی دەغڵی درووێنەکراو ٢ـ لەوەڕگە ٣ـ زەوی نەکێڵدراو ف ١ـ محل محصول درو شدە ٢ـ مرتع؛ چراگاە ٣ـ زمین شخم نخوردە)[2]

**مانای سەرجەمی ئەم نێوە (تاڵەجەڕ) دەبێتە:**

١ـ زەوی ڕەشی خۆڵەمێشی ف زمین سیاە مایل بە خاکستری

٢ـ لەوەڕگەی ڕەشـی خۆڵەمێشـی ف مرتـع و چراگـاە سـیاە مایـل بە خاکستری

٣ـ زەوی پڕ لە تاڵوو ف زمین پر از تالک

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە:

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ سەرچاوەی پێشوو

(تاڵە: سینگ و دار یا چێوی نووکتیژ لە قامیش و چێو و شتی وەک ئەمانە دەتاشرێ. دار یا قامیشی نووکتیژ[ف]چوب یا نی نوکتیز) + (جەڕ: بەند؛ بناوان؛ گرتنی بەری ئاو[ف]سد؛ بند؛ بستن مسیر آب)

**مانای سەرجەمی وشەی تاڵەجەر دەبێتە:** دروست کردنی سەد و بەند بە دار و چرپی و قامیش؛ دروست کردنی بناوان بە دار و چرپی **ف** درست کردن آب‌بند یا سد کوچک بە وسیلەی چوب و درخت و نی نوکتیز و شاخەهای درختان.

# تاوەقڕان

**تاوَەڨْران** **Taweqran**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ئەو دێیە چۆڵکراوە.

وشەکە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تاوە؛ تاو: خێرا؛ بەپەلەفسریع؛ باشتاب) + (قڕان: قڕ بوون؛ تێداچوونی بەکۆمەڵ؛ وەبافوبا؛ تلف شدن سریع و جمعی)[1]

مانای وشەکە دەبێتە: تێداچوون و قڕبوونی خێرا و بەکۆمەڵفتلف شدن سریع و جمعی؛ وبا

بە هەموو ئەو نەخۆشیانەی وەک وەبا و تاعوون کە دەبنە هۆی مردن و تێداچوونی مرۆ و ئاژەڵ، ئەویش زۆر خێرا و بەکۆمەڵ، دەکوترێ تاوەقڕان یا قڕبوون و نابوود بوونی بەپەلە و خێرا و بەکۆمەڵ.

ـ کێوێکیش بەم نێوە «تاوەقڕان» لە نێوان دێیەکانی زێویە و قرەناو و دالوودا هەیە.[2]

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ ل ٣٧٢ کتێبی «جوغرافیای تاریخی کوردستان»، جەلال شافیعی

# تاویشه

**طابیشه** **Tawîşe**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تاو:هەتاو؛ ڕۆژ؛ خۆر ف خور؛ هور؛ خورشید؛ آفتاب) + (ویشە: بێشە؛ شە؛ شوێن؛ جێ ف مکان؛ محل)[١]

مانای وشەکە دەکاتە: شوێن و جێی خۆر؛ بەرخۆر؛ خۆرەتاو ف مکان آفتابگیر؛ محل آفتاب

ئەم چەشنە وشانە نموونەیان زۆرە:

* ئاوایی ترکاشە: لە دوو بەش پێکهاتووە:

ترک: تورک، ئەو نژادەی بە زمانی تورکی قسە دەکەن + شە: شوێن؛ جێ ف محل و مکان)

مانای وشەی ترکاشە کە دێیەکی ناوچەی فەیزوڵڵابەگی بۆکانە دەبێتە: جێ و شوێنی تورک ف محل و مکان ترکها.

* وشەی وەرشە: لە دوو بەش ساز کراوە:

(وەر- ور: گورگ ف گرگ) + (شە: جێ؛ شوێن ف محل؛ مکان)

مانای وشەکە دەبێتە: جێ و شوێنی گورگ ف محل و مکان و مأوای گرگها.

---

١ ل ٢٠٧ کتێبی (زبان‌شناسی کرد و تاریخ کردستان)، نووسراوی بێهزاد خۆشحاڵی

# تایربوغە؛ تاهیربوغە

**طاهر بُغده** **Tahîrbuğe**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ٣٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦٩ کەسە.

بۆ مانا کردنەوە و لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. وشەی بوغە تورکی و وشەی تاهیر عەرەبیە:

(تاهیر: پاک؛ خاوێن؛ نێوی پیاوانە‌ف پاک؛ تمیز؛ نامی برای مردان) + (بوغە: بوغدە؛ گەنم‌ف گندم)

مانای وشەکە: گەنمی تاهیر؛ گەنمی خاوێن‌ف گندم طاهر؛ گندم پاک

**دووهەم**. وشەی بوغە تورکی و وشەی تاهیر عەرەبیە:

(تاهیر: نێوی پیاوان‌ف نامی برای مردان) + (بوغە؛ بۆغۆ[١]: چەشنێ مانگایە‌ف نژادی از گاو)

مانای وشەکە دەبێتە: مانگای تاهیر؛ بوغەی تاهیر‌ف گاو طاهر؛ بوغوی طاهر

لە موکریان بە گای قەڵەو و بەکەیف و سەرکێش دەڵێن: گای بوغە.

**سێهەم**. تاهیر عەرەبی و بوغە تورکی و مەغوولیە:

(تاهیر؛ نێوی پیاوان‌ف نامی برای مردان) + (بوغە؛ بوغا[١] boğa: لە زمانی مەغوولیدا بە مانای کورتەباڵا و نۆکەر و ڕەعیەتە‌ف قدکوتاه؛ دونپایە)

---

١ ل ٥٨ کتێبی «نظام اجتماعی ایران»، نووسینی تێسۆف

مانای وشەکە دەبێتە: تاهیری کورتەباڵا؛ تاهیرەخڕە[ف] طاهر قدکوتاه؛ طاهر کوچولو

کاتێ چەکدارانی تورک چوونەتە ئەو دێیە پیاوێکی چکۆلەی کورتەباڵایان دیوە و ئەو دێیەیان بە نێوی ئەو تاهیرە کردووە.
بە ڕای من واتای دووهەم کە بوغە چەشنێ گایە لەوانی دیکە ڕاستترە.

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# تورجان

**تُرجان** **Turcan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ١٥٩ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٨٠ کەسە.

لە بابەت مانای ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** (تور: توور؛ تووراني؛ تورکفتوراني؛ ترک) + (جان: پاشگری نیسبەت و پەیوەندە کە عەرەب پیتی «گ»یان کردووە بە «ج» یانی وشەی "تورگان"یان کردووە بە تورجان؛ شوێن و جیٚفپسوند نسبت؛ محل؛ مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێی تورکەکان؛ محل و مأوای ترکها

بە ڕای من ئەو بۆچونە لەوانیتر ڕاستترە. دەبێ ئەوەش بزانین زۆر کەس هەن کە تووراني بە تورک نازانن و دەڵێن ئەوانە ئارياييين.[1]

**دووهەم.** مامۆستا ئیبراهیم پووورداود دەڵێ لە زمانی سانسکریتدا توور بە مانای ئازا و پاڵەوانە ولە فەرهەنگە فارسییەکانیشدا هەر بەم واتایە هاتووە. کەوابوو تورجان یانی (جێی ئازاکان؛ جێی پاڵەوانەکانفمکان و مأوای پهلوانان.)[2]

**سێهەم.** لە زمانی کوردی و گیلەکیدا وشەی «تۆوڕ» بە مانای شێت و وەحشی و سەرکێش و نافەرمان هاتووە. کەوابوو وشەی تورجان بە مانای

١ ل ٦٠ تا ٦٤ کتێبی «ایران و ترکان در زمان ساسانیان» نووسراوی عینایەتوڵڵا ڕەزا

٢ ل ٦٠ تا ٦٤ کتێبی «ایران و ترکان در زمان ساسانیان» نووسراوی عینایەتوڵڵا ڕەزا

شوێن و جێی کەسانی نافەرمان و سەرکێشە ف محل و مکان افراد نافرمان و سرکش[١]

**چوارەم.** بە پێی نووسراوەی کتێبی «حقایق الاخبار ناصری» نێوی تورجان، ئەجری (آجری) بووە و ئەجریش وشەیەکی تورکییە کە لە سەردەمی حوکمی تورکەکان لە سەر ئەو دێیە دانراوە.[٢] ئەجری یا ئەجرلوو (اجرلو) بە قۆرچی (چەکدار) و ئەو سەربازانەیان دەگوت کە وەک ژاندارم (ئەو ئەفسەر و سەربازانەی شوێنی کاریان دێ بوو) بۆ ڕاسپاردە و کار و مەئمووریەتی تایبەت کەڵکیان لێ وەردەگیرا.[٣] وا دیارە خەڵکی ئەو دێیە لەو قۆرچیە تایبەتیانە بوون.

ئەجرلوو بە کەسێ دەڵێن کە هەقدەست یا مزە وەردەگرێ ف اجرلو به معنی کسی است که مزد (اجر) دریافت می‌دارد.



وێنەی ٨ـ دێی تورجان، ساڵی ١٢٧٠ی هەتاوی (١٨٩١ی زاینی)

وێنەگر: ژاک دۆمۆرگانی فەڕانسەیی

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

٢ ل ١٨ کتێبی «تاریخچە مهاباد»، نووسراوی سەیید محەممەد سەمەدی

٣ ل ٩٩ کتێبی «تذکرە الملوک» نووسراوی محەممەد دەبیر سیاقی

# تۆمارقامیش

**طومارقامیش** **Tomarqamîş**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٧٥ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٤١٤ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تۆمار: نووسین لە دەفتەردا؛ کاغەز یا قاقەزی لوولدراو؛ نامەفکاغذ پیچیدە شدە؛ نامە؛ ثبت در دفتر)[1] + (قامیش: ڕوەکێکی درێژی ناو بەتاڵ؛ نەی فنی؛ نیزار)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو قامیشەی بۆ نووسین بە کار دێفنی مناسب نوشتن و ثبت کردن.

هەردوو وشـەی تۆمـار و قـامیش هـاتوونەتە نێـو زمـانی کـوردییەوە و هەروەک وشەیەکی کوردییان لێ هاتووە.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# تەمربەگ؛ تەمربەو

**تَمْربَیگ** **Temrbeg**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ٥٤ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٧٨ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تەمر؛ تەمیر؛ تەموور؛ دەمیر: ئاسن) + (بەگ؛ بەیگ: ئاغا؛ خان ف خان؛ آقا؛ ارباب)

مانای وشەکە دەبێتە: ئاسنبەگ؛ ئاسنخان؛ خانی قورس و قایم ف آهن‌بگ؛ آهن‌خان؛ آهن‌آقا

ئەم وشەیە نێوە بۆ پیاوان: وەک تەیموورى لەنگ (تەیموورەشەل). ئەم وشەیە بە تموور، تەیموور[١] و لە ئورووپاش بە تمر[٢] دەخوێندرێتەوە.

---

١ ل ٣٨٩ و ٣٩٠ کتێبی «تاریخ ایران کمبریج»، بەرگی ٥

٢ سەرچاوەی پێشوو.

# تەیمانقەڵا

**تَیمانقَلعه** **Tîman qela**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ٢٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٠٧ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تەیمان: دڕوو؛ دڕک ف خار) + (قەڵا: دژ؛ حەسار؛ بورج و باڕوو ف قلعه)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** قەڵای دڕوو؛ بورج و حەساری دڕکاوی ف قلعەی خار؛ حصار و برج خاردار.

تەیمانقەڵا: قەڵایەک دەوراندەوری تەیمان بێت؛ لە بانە و دێهاتەکانی، تەیمان یانی پەرژین (پرچین)، دیوارێک لە دار و دڕووی وەک چاڵووک.

# تەمووتە

تَموتَه Temûte

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٤٥ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٧٧ کەسە.

ئەم وشەیە بە بۆچوونێک ئاسۆریە (آشوری):

بۆچوونی **یەکەم.** دانانی لەوح یا تەتەڵی خشتی یا بەردین لە ژێر بناغەی تالار و کاخی شایەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵات باو بووە. ئاسۆریەکانیش تەتەڵەیان لە بن دیواری قەسر و کاخەکانی خۆیان دادەنا.

ئاسۆریەکان بەو تەتەڵانەیان دەکوت «تەمەتوو[1]؛ تَمَتو». شایەکانی هەخامەنشیش ئەو کارەیان دەکرد.

هەروەک دەبیندرێ وشەی «تەمووتە؛ تَموتە» لەگەڵ وشەی «تەمەتوو؛ تَمَتو» لە ڕواڵەتدا جیاوازییان هەیە کە پێموایە لە سەر زاری خەڵک و لە گۆ و ئاخاوتن‌دا هێندێک گۆڕدراوە.

بۆچوونی **دووهەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تەموو: تەنگە؛ خاڵیگە؛ قەبرغە؛ قەد[ف]تهیگاه؛ پهلو) + (تە: تا؛ تی؛ تو: جێ؛ شوێن؛ وڵات؛ کێو[ف]محل؛ مکان؛ سرزمین؛ کوه)

**مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ئەو دێیەی لە قەدی کێو هەڵکەوتووە؛ دێی پەنای کێو[ف]روستای کمرکش کوه؛ روستای چسبیده بە کوه؛ آبادی دامنە کوه

---

١ ل ١٣٠ کتێبی «الواح بابل»، نووسینی ئێدوارد شیێرا، وەرگێردراوی عەلی ئەسغەری حیکمەت

# تەمۆغە

تَموغه **Temoğe**

دێیەکە ناوەندی ناوچەی تەمۆغەیە. ١٠٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٢٧ کەسە.

ئەم وشەیە مەغوولی؛ تورکییە و چەند مانای هەیە:

**یەکەم.** (تەمۆغە؛ تەمغا؛ تامغا: ماڵیات و باجێکی بۆ یەکەم جار مەغوولەکان دایانمەزراند. ئەم باجە لە هەموو کەسب و کار و شوغڵێکی شاری وەردەگیرا. هەروەها عەوارز و باجێک بوو کە لە شارەکان لە بازرگانەکان و تاجران وەیا باجێک بوو کە لە دەروازەی شارەکان لە کاسبکاران وەردەگیرا [ف] عوارض و مالیاتی که در شهرها از اصناف و یا مالیاتی که در دروازەی شهرها گرفته می‌شد.)[١]

**دووهەم.** (تەمۆغە؛ تەمغا؛ تامغا: داغ یا مۆرێکی لە سەر ڕانی ئەسپ و چوارپێیەکانی دیکەیان دەدا. مۆری تایبەتی شا. Tamağa[٢]

هۆی ئەوەی نێوی ئەو دێیە تەمۆغەیە ئەوەیە ئەوەیە کاتی خۆی لەو شوێنە ماڵیات و باجیان لە کاسبکار و ئەو تاجرانەی کە لەوێوە ڕادەبووردن وەردەگرت و مۆریان بە کەلوپەل و کاغەز و شتەکانیانەوە دەنا.

لە نێو مەغوولەکاندا لەم وشەیە بۆ نێوی پیاوان کەڵک وەرگیراوە. بۆ نموونە:

ـ نێوی برا چکۆلەی چەنگیزخان «تەمۆغا؛ تەمۆغە» بووە.[٣]

---

١ ل ٥٠٥ کتێبی «تاریخ ایران کمبریج»

٢ ل ٢٩٢ کتێبی «نظام اجتماعی مغول»، نووسینی تێسۆف

٣ ل ٨٠١ کتێبی «ترکستان‌نامە» نووسینی بارتولد

# تیزئاوا

**تیزآباد** **Tîzawa**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٢٩ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٤ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە:

(تیز؛ تێز: توند؛ بەپەلە؛ بەعەجەلە؛ زوو؛ خێرا ف زود؛ باعجله؛ شتابان؛ تند)[١] + (ئاوا: ئاوەدان؛ ئاوەدان کردنەوە؛ دامەزراندن بۆ مانەوە و ژیان ف آباد؛ آباد کردن؛ بنیاد نهادن؛ دایر کردن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئاوەدانکردنەوەی بەپەلە؛ خێرا و زوو ئاوەدانکردنەوە؛ دێیەکی بە پەلە ئاوەدان کراوەتەوە؛ ئاواییەکی بە خێرایی دروست کراوە ف با عجله آباد کردن؛ زود و شتابان آباد کردن؛ با عجله و سرعت آباد شده؛ خیلی زود درست شده

مەبەست ئەوەیە ئەو ئاواییە زوو و بەپەلە دروست کراوە. لە جێ و شوێنی دیکەش شتی ئاوا هەیە. بۆ وێنە: لە بۆکان خیابانێکی لێیە خەڵک نێویان ناوە «یەکشەوە» یانی ئەو خیابانە بە شەوێک دروست کراوە.

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی و فەرهەنگی فارسی عەمید

# تیکانلوو

**تیکانلو** **Tîkanlû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ٢٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٧ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تیکان: دڕوو؛ دڕکفخار) + (لوو: پاشگرە بە مانای خاوەن؛ شوێن)

مانای وشەکە دەبێتە: شوێن و جێی دڕکودالفخارستان

لە مهاباد دێیەک هەیە بە ناوی «تیکانلووجە».

# تیلەکۆ

**Tileko** **تیلکو**

نـاوچەیەکە پـان و بەریـن لە بەینـی دوو شـاری سـەقز و دیوانـدەرەدا هەڵکەوتـووە. تیلەکۆ دوو بەشـە: ١ـ ئاران، بەشـی گەرمتری نـاوچەکەیە و لە ١٤ ئـاوایی پێکهـاتووە. ٢ـ هەوەتـوو، بەشـی سـارد و ییلاقـی و هەوارگەی ناوچەکەیە و لە ٣٢ ئاوایی پێکهاتووە.

ئاواییەکانی تیلەکۆ بە سەر دوو شاری سەقز و دیواندەرەدا بەش کراون. ئێستا بە ئاوایی ئێرانشا کە شارەدێیەکە دەڵێن تیلەکۆ.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم. وشەی تیلەکۆ کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(تـیلە: تـێلە، تـاڵە، ڕەشتـاڵە، ئەسـمەر، گەنمڕەنگ **ف** گندمگون، سیەفام) + (کۆ: کەژ، کێو، شاخ **ف** کوە)

کەوابـوو **واتـای سـەرجەمی وشـەکە دەبێـتە:** کێـوەڕەش، شـاخەڕەش، بەردەڕەش **ف** سیاەکوە، سیاەسنگ

لە چەند شوێنی دیکەش تیلەکۆ هەیە. وەک:

تیلەکۆ لە شاری دێگولان

تیلەکۆ لە شاری کامیاران

تیلەکۆی سەروو لە ئەزگەلەی سەلاسی شاری جوانڕۆ

تیلەکۆی خواروو لە ئەزگەلەی سەلاسی شاری جوانڕۆ

کێوی تیلەکۆ لە ئەزگەلەی سەلاسی شاری جوانڕۆ

**دووەم.** وشەکە تورکییە و هاتۆتە نێو زمانی فارسیشەوە:

(تـیله: شـتێکی خـڕی شووشــەیی یـا چینـی یـا بەردیـن، کە منـداڵان و گەورەسـاڵان کـایەی پیٚ دەکەن. مەڕمەڕ، هەڵمـات، دەسکەلـلا، کەلـلا ف گلـولە کوچک و توپر سنگی یا بلوری کە کودکان با آن بازی می‌کنند.) + (کۆ: کێو، شاخ، کەژ ف کوە)

**واتـای سـەرجەمی وشـەکە دەبێتە:** کێوی مەڕمەڕی، کێوێکی هەڵمـات و کەللای لیٚ دروست دەکریٚ ف کوهی کە بتوان از آن تیلە سنگی درست کرد.

من بۆچوونی یەکەمم پیٚ ڕاستە.

# جافرخان

**جَعفَرخان** **Cafirxan**

ئـاواییيەكە سـەر بە نـاوچەی خورخـورەی سـەقز. ٦٩ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٣٩٤ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(جـافر: نێوە بـۆ پیـاوان؛ کـوردیکراوی وشـەی «جعفر»ە کە وشـەیەکی عەرەبیە؛ جەعفەر ف نامی است برای مردان؛ تلفظ کردی کلمەی «جعفر») + (خان: ئاغا؛ میر؛ گەورە ف آقا؛ ارباب؛ میر؛ بزرگ)

**مانـای تێکـڕای وشـەکە دەبێتە:** جەعفەرئاغـا؛ جەعفەرخـان ف جعفرخـان؛ جعفرآقا.

# جونیان

**جُنیان** **Conyan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ٩٧ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٢٠ کەسە.

جونیان وشەیەکی عەرەبیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(جون؛ جن: جنۆکە، ئەجننە ف جن) + (یان: پاشگری پێوەند ف پسوند نسبت)

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. جن یا ئەجننە لە ئیسلامدا:

لە ئیسلامدا هەرکام لەو بوونەوەرانەی نابیندرێن خاوەن هێزێکی پەرسروشتی (فەوقە تەبیعی) و خاوەن عەقڵ و فامن کە ئاکارێکی وەک مرۆڤیان هەیە و دەتوانن خۆیان بە هەموو شکڵ و فۆرمێک دەربێنن.[١]

**دووهەم**. جن یا ئەجننە لە ئەساتیردا (میتۆلۆژی): مانای ئەجننە لە ئەساتیردا وەک ئەجننە لە فەرهەنگی ئیسلامدا نییە. بە واتایەک لە ئەساتیردا ئەجننە بریتیە لە فریشتە و پارێزەری (ڕوح) کە بە دوو دەستە دابەش دەبن: دەستەی چاک و دەستەی خراپ.[٢]

بە بۆچوونی من ئاوایی جونیان، ناوێکی ئەساتیری و کۆنە و مێژووی ئەو دێیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بڕوای خەڵکی ناوچەکە بە ئایینی

---

١ فەرهەنگی عەمید

٢ ل ٩٢ کتێبی «اساطیر آشور و بابل»، ف. ژیران و گ. لاکوئە

مەزدەیەسنا (بڕوا بە دینی زەردەشتی). هەروەک ئاواییەکانی دەوروبەر و نزیکی ناوچەکە: سپەوڕە، پارسانیان، دەرەهوان، ئێراو، هەوی، خوڕخوڕە و چەند دێی دیکە.

لە لاپەڕە ١٣٥ی کتێبی «نخستين انسان و نخستين شهريار»، نووسینی ئارتوور کریستیەن سێن و وەرگێڕدراوی ژالەی ئاموزگار و ئەحمەد تەفەزولی، ئاماژە بە بونـدێهش (بندهش) بەشی ١٥ بەندەکانی ٢٤ و ٣١ کراوە. لەو ئاماژە و بابەتەدا باسی ئەوە کراوە کە ژن و مێردێک بە نێوی فرواگ و فرواگین ١٥ جووت (دووانە) منداڵیان بووە کە هەرکام لەم جووتانە بوون بە نژادێک (تۆرەمەیەک). هەر ئەم نژادانەن کە زاوزێیان کردووە و زۆر و زیاد بوونی بەرەکانی جیهانیان لێکەوتۆتەوە. بڕوانن:



هەروەک لە ســــەرەوە دیـــارە، "جونیـــان"یش لە تـــۆرەمە و ڕەگەزی کیومەرسە «ئادەم» و وەک نژادێک کە وەچەی لێ دەکەوێتەوە، لە ئەساتیردا باسی کراوە.

سـێهەم. ئەم وشــەیە «جونیـان»، عەرەبـی - کوردییـە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(جـون: لە بـنەڕەتدا جونـد بـوە کە وشــەیەکی عەرەبیـیە و ئەویـش لە وشەی «گوند ـ گُند» کە وشەیەکی پەهلەوییە وەرگیراوە. واتاکەی ئەرتەش و سپایە. وەکو زۆر وشەی دیکەی کوردی پیتی «د»یەکەی ناخوێندرێتەوە؛ بۆ نمـوونە قـادر بە قـائر دەخـوێننەوە.) + (یـان: وشــەی پەیوەنـد و نیسـبەتە؛ نیشاندەری پێوەندی وشەی پێش خۆی بە کەسانێکی دیکەوەیە.)

کە وا بوو واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە: ئەوانەی سەر بە سپا و ئەرتەش و هێزی چەکدارن□ وابستگان و طرفداران سپاه و ارتش و نیروهای مسلح

# جەمیان

جَمیان **Cemyan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ١٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٦١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

یەکەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(جەم: کۆ، کۆبوونەوە، جەمع[ف] جمع؛ کثیر، فراوان از هرچیز) + (یان: وشەیەکە بۆ پەیوەند و نیسبەت[ف] کلمەای برای نسبت دادن چیزی بە کلمەی دیگر)

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەی جەمیان دەبێتە:** ئەوانەی پەیوەند و نیسبەتیان لەگەڵ «جەم» هەیە؛ ئەو کەسانەی سەر بە «جەم»ن و پێوەندیان لەگەڵ «جەماوەر» هەیە، ئەویش جەمی یارسانەکان.[ف] منسوبان بە «جم»؛ آنها کە پیوند با «جم؛ جمع» دارند کە البتە منظور پیوند با جمع یارسانیهاست.

بە بڕوای من ئەم «جەم»ەی لێرەدا باسی کراوە، هەر ئەو «جەم»ەیە کە لە نێو کاکەییەکان یا «ئەهلی هەق، یارسانیەکان»دا باوە و واتای تایبەتی هەیە. وا دیارە هەروەک لە جێگایەکی دیکەش باسم کردووە (لە باسی ئیسحاقئاوا)، پڕیشکەی ئایینی یارسانییەکان هەتا ئێرەش گەیوە.

ئایینی ئەهلی هەق لە ساڵی ١١٠٠ی زایینی لە کاتی دەسەڵاتداری سەلجووقییەکان دەستپێدەکا. لەو ساڵانەدا موبارەکشای ناسراو بە

شاهخوشـین له لوڕسـتاندا سـەری هەڵـدا و ئـایینی حەقیقەتـی له بەشـێکی لوڕسـتان بـرەو پێدا. پاشـان ئەو ئـایینه له لایەن کەسـانێکی دیکه بەتـایبەت سانسەهاک یا سوڵتان ئیسحاق نویکرایەوه و گیان و تینێکی تازەی وەبەر هـاتەوه. ئەو ئـایینه پەلـی هاویشـته زۆر جێگـا بـۆ وێنه: ئـاوایی ئیسـحاقئاوا؛ ئاوای خۆشێنان؛ ئاوایی دەرەشێخان و ئـاوایی پارسـانیان و چەند جێی دیکه له سەقز.[1]

جـا مـن پـێموایه دێـی جەمیـان یەکێـک لەو شـوێنانەیه که تیشـکی ئەو ئایینەی پیگەیشتووه.

یارسانییەکان شوێنی کۆبوونەوەیان «جەمخانه»یه که لەوێدا کۆدەبنەوه و ڕازونیـاز دەکەن و بـاو و بـرەوی دینـی خۆیـان لەوێـدا جێبەجـی دەکەن. «جەمخـانه» هەروەک مـزگەوت له نێـو مسـوڵمانەکاندا وایه. ئەو کەسـانەی دەیـانەوی بـبن به یـاری «یارسـانییەکان»، دەبـی کـاتی جەمبـوونەوه له جەمخـانەدا، بچـن بـۆ ئەوی و لەوی حـازر بـن و هەنـدی خـۆراکی وشـکیش لەگەڵ خۆیان بەرن. هەرکەس تاقینەکرێتەوه و نەناسری، له لایەن خەلیفه و دەسـتوپێوەندەوه بیگومـان ئەو کەسـه نـاتوانی ببـی به یـاری ئەو ئـایینه و نێوی تۆمـار نـاکری. کاکەییەکـان (یارسـانییەکان) کۆبوونەوەیەکیـان هەیه به نێوی «جەمی چـلانه» یـانی کۆبوونەوەی چـلتەن - چـلکەس «یـار»، که له زنجیرەیەکـــدان. پەیڕەوانـــی ئەهلـــی هەق له کـــاتی کۆبوونەوەکانیانـــدا له «جەمخـانه» که مەڵبەنـد و بارەگـای ئایینییـانه، شـێعر و سـروودی یارسـان «سەرەنجام» به ئاوازی تەموورەوه دەخوێننەوه.[2]

---

١ ل ٦٣ کتێبی «ڕەسەنایەتی زمانەکەت بناسه»، محەمەدئەمین هەورامانی

٢ مێژووی موزیکی کوردی، محەمەد حەمەباقی

دووهەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(جەم: لە نێو شایەکانی ئەفسانەیی پیشدادیان کە بریتین لە

١ـ کیومەرس ٢ـ سیامەک ٣ـ هووشەنگ ٤ـ تەهموورس ٥ـ جەمشید ٦ـ ئاژیدەهاک ٧ـ فەرەیدوون. لە هەموویان بەنێوبانگتر و خۆشەویستتر، جەم «جەمشید» و فەرەیدووون. جەم فەرمانڕەوای سەردەمێک لە گەورەیی و شان و شکۆ بوو کە لەودا خۆشبەختی و بەختەوەرییەکی بێغەل و غەش حاکم بوو. شایەکی کە ڕسیان و هەڵدێرانە غەمبارەکەی کە ئاکامی غەرە بوون و خۆبەزلزانی ئەو بوو، ڕۆژڕەشییەکی یەکجار زۆری بۆ خەڵک بە دوای خۆیدا هێنا.[1]

ئەهورەمەزدا پێش ئەوەی دینی زەردەشتی بە زەدەشت ڕاگەیەنێ، بە جەمی پێشنیار کرد و ئەو دینەی پێ فێر کرد. بەڵام جەم بە ئەهورەمەزدای ڕاگەیاند کە ناتوانێ ئەو کار و ئەرکە قەبووڵ کا و لە ئەستۆی گرێ.[2]

جەم هەر ئەو کەسەیە بە پێشنیاری ئەهورەمەزدا «وەر« (قەڵا)یەکی ساز کرد هەتا تووی چوارپێیان، ئەسپان، خەڵک، پەلەوەر و سەگان لەوێدا ڕاگرن و لە سەرمای ملکووس بیانپارێزن تا زەوی بە یەکجاری تێدا نەچێ. پاش ئەوەی «فەڕیشایی» لێ وەردەگیرێتەوە، ناچار دەبێ تەختی شایی بەجێبێڵێ و نزیکەی سەت ساڵ بە دزیەوە لەگەڵ خوشکە دووانەکەی «جەمی»دا بژی و بەڵام براکەی بە نێوی سیپتوور ئاخریەکەی دەیبینێتەوە و بە مشار لەتی دەکا و دەیکوژێ.

+ (یان: وشەی پێوەند و نیسبەت[ف] کلمەی نسبت و پیوند)

---

١ ل ٢٨٣ کتێبی «نمونەهای نخستین انسان و نخستین شهریار»، ئارتور کریستیەن سێن، وەرگێرانی: ژالە ئامووزگار، ئەحمەد تەفەزولی

٢ سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٠٢ و ٣٠٥

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەی جەمیان لێرەدا دەبێتە:** ئەو کەسانەی هـۆگری «جەم»ن. ئەو کەسـانەی سـەر بە «جەم»ن.ف منسـوبان بە «جـم» جمشید پادشاه کیانی.

ئەو نێونانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەلاتی ساسانیان لە ناوچەکەدا.

بۆچوونی سێهەم. ئەم نێوە کوردییە و یەک بەشە:

(جمیان: بزاو؛ بزووتن؛ جوولە؛ جوولان[1] ف جنبیدن؛ جنبش؛ حرکت)

کە دەکـرێ بلێـین ئەم وشـەیە هێـدی هێـدی لە سـەر زاری خەڵـک ئاڵوگۆڕێکی کەمی بە سەر هاتووە و بووە بە «جەمیان».

بۆچوونی چوارەم. وشەکە کوردییە و سێ بەشە:

(جەم: کۆ، کۆبوونەوە؛ چەند کەس یان چەند شت ف جمع؛ کثیر؛ فراوان از هـر چیـز) + (ی: یـای نیسـبەت ف یـای نسـبت) + (ان: ئەم ئەلـف و نـوونە نیشانە و دیاردەی «ضمیر شخص جمع»ە و ماناکەی «ئەوان»ە. لە وەڵامی ئەم پرسیارە: جەمعی کێ؟ دەڵێین جەمعی ئەوان یا جەمیان ف جمع یا تجمع چە کسی؟ جمع آنها یا جمعشون

لە کاتی خۆیدا یـا سـەدان ساڵ لەوە پێش مەبەست کام جەم یا جەمع بووە نازانین. یا زۆر جار لە گفتوگۆدا دەگوترێ: «جەمیان جەمە، هەرمنیان کەمە».کە بە فارسی دەبێتە «جمعشون جمعە، فقط منو کم دارند.»

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# جەوشەن

جَوشَن                                                  **Cewşen**

دێـیەکە ســەر بە نــاوچەی زولفەقــاری سەرشـیوی ســەقز. ٥٧ مــاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٤٩ کەسە.

ئەم وشەیە عەرەبیە و کۆیەکەشی دەبێتە: جَواشن

(جەوشەن: ١ـ چەشنێ زرێیە کە لە بازنەی ئاسنینی بە یەکەوە نووساو و چێکراوە[ف]نوعی زره با حلقەهای فلزی بهم چسپیده و بدون آستین ٢ـ پارێزەر؛ ڕاگر[ف]محافظ[1]

لە کۆندا کە شەڕ تەنبەتەن و بە نێزە و شمشێر بوو، پیاوی شەڕکەر بۆ پاراستنی خۆی لەو جلە ئاسنینە کەڵکی وەردەگرت.

ڕوودەکی دەڵێ:

دانش اندر دل چراغ روشن است

وز همه بد بر تو جوشن است.

واتە: عیلم و زانست لە نێو دڵدا چرایەکی ڕووناکە/ لە هەمووشی خراپتر لە بەرتدا جەوشەنە.

١ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی عەمید

# چاپان

**چاپان** **Çapan**

دوو ئاوایی سەر بە ناوچەی ئیمام بەم نێوە هەیە:

چاپانی سەروو کە ٤٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٨٤ کەسە.

چاپانی خواروو کە ٤٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢١٤ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی مانای ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. وشەکە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(چاپ: ورد کردن؛ جنین ف خرد کردن) + (ان: پاشگری بکەر ف پسوند فاعلی)

مانای وشەکە دەبێتە: وردکەر؛ ئەو کەسەی شتێک وەک گۆشت یا وێنجە ورد دەکا ف خردکننده

**دووهەم**. وشەکە تورکییە و ماناکەی بریتیە لە:

تالآنچی؛ تالآنکەر ف غارتگر؛ چپاولگر[1]

**سێهەم**. وشەکە تورکییە و ماناکەی: جلوبەرگی کۆن و دڕاو ف لباس ژندە و پارە[2]

**چوارەم**. وشەکە تورکییە و ماناکەی: سوارێکی چوار ناڵ دەڕوا ف سواری کە چهار نعل می‌تازد[3]

**پێنجەم**. چاپان نێوی دێیەکە لە شین‌جیانی چین.

لە شاری ئەهەری ئازەربایجانی ڕۆژهەڵاتیش دێیەک هەیە بە نێوی چاپان.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

٣ سەرچاوەی پێشوو

# چاخلوو

**چاغرلو** **Çaxlû**

دێیەکە سەر بە ساحێب. ٨٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٨٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

**یەکەم.** (چاخ؛ چاخیر: شەراب؛ مەی ف شراب؛ می؛ عرق) + (لوو؛ لو: خاوەن؛ شوێن؛ جێ ف دارندە؛ محل؛ مکان)[١]

ماناکەی دەبێتە: شوێنێکی شەڕابی لێیە؛ شوێنی ڕاگرتنی شەڕاب ف محل و مکانی کە دارای شراب و می باشد؛ مکان نگهداری شراب

**دووهەم.** چاخلوو یا چاخیرلوو بە فۆرمی «چاخیرلی»ش دەگوترێ و دەنووسرێ کە ماناکەی دەبێتە: مەست؛ سەرخۆش ف مست؛ سرخوش[٢]

---

١ ل ٤٧٣ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

# چیچیخوار

**چیچیخوار** **Çîçîxwar**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٢٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٧ کەسە.

ئەم وشەیە مەغوولیە و نێوی شارێکی گەورەی سەر بە ئەیالەتی مەنچووری مەغوولستانی ناوخۆیی (مغولستان داخلی) چینی کمونیستە کە لەسەر نەخشەی جۆگرافیایی دەنووسرێ «چیچیهار».

دیارە ئەو مەغوولانەی هێرشیان کردە سەر ئێران (ساڵی ١٢٥٦ز) نێوی شوێنێکی وڵاتی خۆیان لە سەر ئەو دێیە داناوە. وەک: نێوی وڵاتی «تبت»یان لەسەر دێی «تبت»ی نزیک بۆکان داناوە. هەروەها زۆر شوێنی دیکەش کە نێوی شارەکانی مەغوولستان، تبت و چین و جێگاکانی دیکەیان لە سەر داناوە.

# چاڵگە

**چالگە** **çalge**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. لە ناوچەی هەوەتوو هەڵکەوتووە. ١٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٩ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(چاڵ: ١ـ قووڵکەی گەورە بۆ دەغڵودان و بەفر ٢ـ قوپاو؛ ڕۆچوو ٣ـ پووش و چیلکە|ف| ١. چالە ٢. فرورفتە ٣. خاشاک) + (گە: جێ؛ شوێن|ف| میدان؛ محل؛ جا؛ مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** جێ چاڵەکە؛ شوێنی چاڵ و قووڵاییی|ف| محل و مکان چال؛ مکان گودی

وشەی "گە" لەگەڵ زۆر وشە و نێوی دیکە، وشە و نێوی تازە دروست دەکا. وەک:

ـ جێگە: شوێن|ف| جا؛ مکان

ـ ڕێگە: ڕێ؛ شوێنی هاتوچۆ|ف| راه

ـ مۆڵگە: جێگەی مۆڵخواردن؛ شوێنی حەسانەوەی گاوگۆڵ|ف| جا و محل آسایش گاو و گوسالە

ـ دانگە: جێگەی گیاخستن بۆ ئاژەڵ لە زستاندا کە لە دەرەوەی تەویلەیە|ف| علفگاه حیوانات در زمستان در بیرون آغل

ـ شەڕگە: مەیدانی جەنگ|ف| رزمگاه؛ صحنەی نبرد و پیکار.

# چنارتوو

**چنارتو** **çnartû**

دێـیەکە ســەر بە نــاوچەی خورخــورەی ســەقز. ٢٩ مــاڵە و ژمــارەی دانیشتووانی ١٣٤ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(چنار: دارێکی بەرزە ف درختی است بلند) + (توو: وڵات؛ شوێن؛ جێ ف مکان؛ سرزمین؛ جا)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** وڵات و شوێنی داری چنار ف مکان و محل درخت چنار

یان ئاواییەکی لە کاتی خۆیدا داری چناری زۆر لێ بووە.

# چۆمەڵوو

**Çomelû** **چوملو**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـانی سـەقز. ٩٠ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٧٩ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم نێوە سێ بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** وشەیەکی تێکەڵاوە لە کوردی و تورکی و سێ بەشە:

(چـۆم: ڕۆ، ڕووبـار، چەم، وشـەیەکی کوردییـە ف کلمەای است کـوردی: رود، رودبار، نهر، رودخانه) + (ە: هـای ناسـێنەر ف هـای معرفه و شناسـه) + (ڵوو[١]: لو، وشەیەکی تورکییـە، ئاوەڵنـاوی نیسـبییە. ئەوەیە کە کەسـێ یـا شـتێ بە شوێنێ یا شتێک نسیبەت دەدا.)

**واتـای سـەرجەمی وشـەکە دەبێتە:** شـوێنێکی چـۆم و ڕووبـاری هەیە ف محلی کە دارای رودخانە می‌باشد.

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە و سێ بەشە:

(چـۆم: ڕووبـار، چەم ف رود، رودبـار، رودخـانە) + (ە: هـای ناسـێنەر ف هـای شناسـە و معـرفە) + (ڵـوو: سـواو و کورتکـاوی وشـەی «ڵان»ە کە پاشگری شوێن و جێیە ف سادە شدە کلمە «لان» کە پسوند مکان است)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** چۆمەڵان، جێگـایەکی چـۆم و ڕووبـاری لێیە. ف مکانی کە دارای آب و رودخانە است.

وەک مێشـەڵان: جێیەکی مێشـە و بێشـە و دار و پنچکێکی زۆری لێیە ف بیشەزار

---

١ ل ١٨ی فەرهەنگی تورکی بە فارسی شاهمەرەسی.

قامیشەڵان: شوێنی قامیش ف نیستان، نیزار

* دێیەک بە نێوی چۆمەڵان لە شارویرانی مەهاباد هەیە.[١]

**سێهەم.** وشەیەکی تورکییە و یەک بەشە:

(چۆمەڵـــوو: چۆملـــو، جـــاری وایە دوو وشـــەی «لـــو» و «لـــی» کە هەردووکیـان لە زمـانی تورکیـدا ئاوەڵنـاوی نیسـبی «صـفت نسـبی»ن، جێـی یەکتر دەگرنەوە. وەک: تەورێزلوو، تەورێزلی. کەوابوو دەتوانین بڵێین وشـەی «چۆمەڵـوو» هەمـان وشـەی «چۆمـاڵی»یە کە واتـاکەی «مێـرووله، مێـروو، مرۆچە»یە ف چوملو هەمان کلمه چومالی است که در زبان ترکی به معنی مورچه میباشد.

دەکرێ بڵێین یەکەم جار کە تورک هـاتوونەتە ئەم جێیە تووشـی شـارە مێرووله بووبێتن و بەم بۆنەیەوە نێوی دێیەکەیان نابێ مێرووله. لەم چەشنە، دێی قارنجەی بۆکانیش هەیە کە واتاکەی مێروولەیە.

* دێـیەک بە نێـوی «چۆمـالوو» لە شـاری کاغەزکونـانی هێروئابـاد (کاغذکنان) پارێزگای زەنجان هەیە.[٢]

---

١ فەرهەنگی فارسی بە فارسی دێهخودا

٢ سەرچاوەی پێشوو.

# چراغ وەیس

**چراغویس** **Çraqweys**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ٣١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٧٤ کەسە. ئەم وشەیە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(چراغ: ١ـ وەسیلەیەکە بۆ ڕووناکی، ماڵە گەورە، جێگای پەنا و هانا، مەبەست لە شێخ و پیرە، ڕووناکی ٢ـ زاوا ف ١ـ وسیلەای است برای روشنایی، خاندان بزرگ، منظور شیخ و پیر و سید است ٢. داماد)[1]

لە ڕاستیدا ئەم وشەیە لە زۆر جێ وەک پیر و شێخ کەڵکی لێ وەرگیراوە. مەبەستیش ئەوەیە چراغ ڕووناکی دەری ڕێگای تەریقەت و خوداناسیە و بە ڕووناکی خۆی مورید و ڕێڕەوەکان بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنموونی دەکا.

بۆ نموونە لێرەدا نێوی چەند ئاوایی کە نێویان وشەی «چراغ»ی پێوەیە، دەخەینە بەرچاو:

- چراغاباد (چراغ آباد) لە دێگولان
- چراغاوا (چراغ آباد ـ شکرآباد) لە قوروە
- چراغستان لە جوانڕۆ
- چراغەوداڵ (چراغ ابدال) لە شاهیندژ

لە وشەی سراجیش کە هەر بە مانای چراغە بۆ نێوی دێ کەڵک وەرگیراوە. وەک: "سراجگا" و "سراجاوا۔ سراجآباد"ی سەقز.

---

١ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی دێهخودا.

+ (وەیس: نێوە بۆ پیاوان، دوو کەسایەتی هەن نێویان «وەیس»ە و زۆر بەنێوبانگن: ١ـ وەیسولقەرەنی «اویس القرنی» کە دەڵێن لە پیاوچاکان و ئەسحابەکانی پێغەمبەری ئیسلام بووە. گۆڕەکەی لە شاری مایدەشتی کرماشانە. زۆر کەس بۆ زیارەتی دەچنە سەر گۆڕی لەو شوێنە. ٢ـ دوو عاشق و ئەویندارى ئەفسانەیی هەن نێویان «وەیس» و «ڕامین»ە. داستانی ئەو دوو ئەویندارە لە سەر ئەساس و بنچینەی ئەفسانەیەکی کۆنی پەهلەوی داڕێژراوە. فەخرەدین ئەسعەدی گورگانی لە بەینی ساڵەکانی ٤٣٢ ک.م هەتا ٤٤٦ی ک.م لە زمانی پەهلەوییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

جا بە هەر هۆیەک بێ، زۆر کەس نێویان «وەیس» یان «وەیسە»یە، چ لە وەیسولقەرەنییان وەرگرتبێ، چ لە ئەفسانەی «وەیس و ڕامین». دەتوانین بڵێین ئەو شوێنە پیاوچاک و شێخ و پیرێکی لێ بووە بە نێوی وەیس کە دێیەکەیان بە نێوی ئەو کردووە بە چراغ وەیس:

شەو لە خەودا من چراغ بووم، دڵ چراغ بوو، جان چراغ

ئەی لە بەر عەیشی شەوی دی، گیان چراغ، جانان چراغ[1]

***

چراغم تۆمەن، چراغم تۆمەن/ ئێندە من تاسەی دیداری تۆمەن[2]

لە دیوانی بێسارانیشدا لە تێکڕای شیعرەکانی پیتی «چ»، ٧٥ شیعریان بە وشەی «چراغ» دەست پێدەکەن.

سەرەتاکەیان:

چراغ ئەر ساتێ دوور گنون جە تۆ/ نەمانون شەڵڵا بوینوون ئەوڕۆ

کۆتاییەکەیان:

چراغم یاران، چراغم یاران/ ئیمشەو جە خاودا شیم وەلای یاران

---

١ دیوانی وەفایی

٢ دیوانی سەیدی هەورامی

# حانەمیران

**حانەمیران** **Hanemîran**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ٦٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣١٢ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(حانە؛ هانە؛ هانی: کانی؛ چاوەف چشمە) + (میر: گەورە؛ سەردار؛ ئەمیر؛ شاف امیر؛ سردار؛ شاه) + (ان: نیشانەی کۆف نشانە و علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی ئەمیران؛ کانی گەورەپیاوانف چشمەی امیران؛ چشمەی بزرگان

لە وشەی "حانە" یا "هانە" یا "هانی" لە زۆر شوێن لە جیاتی کانی و چاوە کەڵک وەرگیراوە. وەک: هانی گەرمەڵە لە مەریوان، حانەسارده لە دەرەزیارتی سەروو لە سەقز، حانەپیڵێ لە دەرەزیارتی سەروو لە سەقز.

# حاجی مەمەدان

**حاج ممدان** **Hajîmemedan**

ئەم دێـیە سـەر بە نـاوچەی سەرشـیوی سـەقزە. ٥٩ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٣٤١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی وشەکە دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم. وشەی حاجی مەمەدان کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(حاجی: بە کەسێک دەڵێن کە لە ماوەی عومریدا لانیکەم جارێک چووبێ بـۆ حەج ف بە کسـی گفـتە میشـود کە حـداقل یکبـار مراسـم حـج را بە جـای آوردە باشد)

ئەم وشەیەش وەک: شێخ، پیر، سەید، چراغ و سـراج بـۆ نێوی ئـاوایی و شوێنەکانی دیکە کەڵکی لێ وەرگیراوە. وەک:

* حاجی تاوە (حاجی اتابک لە نووسینی ڕەسمیدا) کێوێکە لە ساحێبی سەقز
* حاجی ئۆمەران (حاج عمران) شارۆچکەیەکە لە کوردستانی عێراق
* حاجی ئەول (حاجی عبدل) دێیەکە لە سەرشیوی سەقز
* حاجی مووسا (حاج موسی) دێیەکە لە دیواندەرە
* حاجی شۆڕە، دێیەکە لە کامیاران
* حاجی حەسەن (حاج حسن) دێیەکە لە سەقز
* حاجیئابادی گەورە (حاجی آباد بزرگ) دێیەکە لە قوروە
* حاجی ئاباد، دێیەکە لە بۆکان

+ (مەمەد: گـۆڕدراو و سـواوی وشـەی «مـحەمەد» ف خلاصـە کلمـە «محمد») + (ان: پاشبەندی جێ و شوێن ف پسوند مکان و محل)

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** شوێنی ژیانی حاجی محەمەد ف محل . مکان زندگی حاجی محمد.

**دووهەم.** وشەیەکی کوردییە و سێ بەشە:

(حاجی: کەسێکی لانیکەم جارێک تەوافی ماڵی خودای کردبێ ف کسیکە بە زیارت خانە خدا رفتە باشد) + (مەمەد: محەمەد، نێوە بۆ پیاوان ف نامی برای مردان، تغییر یافتە کلمە محمد) + (ان: ئەلف و نوونی باوک و فرزەندییە، ئەلف و نوونی ئەبوەت - ابوت ف الف و نون پدر و فرزند «ابوت»). وەک:

بابەکان ← کوڕی بابەک

قوبادان← کوڕی قوباد

کاوسان← کوڕی کاوس

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** حاجی کوڕی محەمەد ف حاجی پسر محمد.

* لە ناوچەی «میرەدێ»ش ئاواییەک هەیە بە نێوی هەمزەقەرەنیان کە بە بۆچوونەکانی سەرەوە دەبێتە:

١. شوێن و جێی هەمزەی کوڕی قەرەنی ف محل زندگی حمزە پسر قرنی

٢. جێ و مەکانی هەمزەی قەرەنی ف محل زندگی حمزە قرنی

# خاوێران

**خاویران** **Xawêran**

مەزرایەکە لە ئاوایی پیریۆنس.

ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(خاوێر: خەوبردنەوە؛ باوێشک؛ نێوان بێداری و خەو[ف]پینکی؛ حالتی میان خواب و بیداری)[1] + (ان: پاشگری کۆیە؛ نیشانەی کۆیە[ف]پسوند و علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** خەواڵووەکان؛ ناوشیارەکان[ف] خوابآلودگان؛ ناهوشیاران

بە بڕوای من ئەم خەواڵوویی و ناوشیارییە بنەمای ئایینی و عێرفانی هەیە (بەتایبەت لە شوێنێکی وەک دێی پیریۆنس). ئەوانە ئەوینەکەیان بە پیر و مورشید بە چەشنێ لە دڵیاندا جێگیر بووە، کلیلی خەیاڵیان توانای ئەوەی هەیە کە هەموو دەرگایەک (خەونی خەواڵوویی نەخەوتوو) بکاتەوە و بە پێی توانای خۆیان ئەو دیمەنانەی دێنە بەرچاوی خەیاڵیان، لە دەفتەری خەیاڵیاندا تۆماری کەن.[2]

ڕۆژ و شەو دایم لە بەر دیدە و خەیاڵم حازری
سا چ فەرقێکی هەیە بۆ من ئیتر ئێرە و ئەوێ[3]

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ ل ١٣٦، کتێبی ڕەسەنایەتی زمانەکەت بناسە. نووسینی موحەمەدئەمین هەورامانی

٣ شیعری مستەفابەگی کوردی ـ گۆرانی تایر تۆفیق

# خەییەر

**خَیدَر** **Xeiyer**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ٥٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٥٢ کەسە.

بۆچوونی یەکەم: ئەم وشەیە پارسی (پەهلەوی)یە و لێکدانەوەی بەم چەشنەیە:

ـ ئێرانییەکان هەر بەو چەشنەی نێوی یەکێک لە ئەمشاسپەندەکانیان (فریشتەکانی نزیک بە یەزدان و پاکانی نەمر ف فرشتگان مقرب یا پاکان جاوید) لەسەر مانگەکان دانابوو یا مانگەکانی ساڵیان بە نێوی ئەوانەوە کردبوو، سی ڕۆژەی مانگیشیان بە نێوی سی ئەمشاسپەندەوە کردبوو و هەر ڕۆژێکیان بە نێوی ئەمشاسپەندی خۆی بانگ دەکرد:[١]

| ڕۆژ | نێوی پارسی ڕۆژ | نێوی ئاوێستایی | نێوی فارسی | مانای وشە بە کوردی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | | | | |
| ٢ | | | | |
| ... | | | | |
| ١١ | خەییەر | Hvarakhshita<br>هورخشیتا | خور؛ خورشید | خۆر، ڕۆژ، هەتاو، تاو |
| .... | | | | |
| ٣٠ | | | | |

ـ ئەم ڕۆژە کە یازدەهەمین ڕۆژی مانگی زەردەشتیە، بە ڕۆژی خۆر یا ڕۆژی هەتاو (بە فارسی: خور روز) ناسراوە و نێوی دەهێنن. کەوابوو دەبێ بڵێین ئەم دێیە بە نێوی خۆرەوە کراوە.[٢]

بۆچوونی دووهەم: خێر نێوی گوڵێکە کە «هەمیشەبەهار»ی پێ دەڵێن.[١]

---

١ ل ١٣٩ کتێبی «اصل و نسب و دین‌های ایرانیان»، عەبدولعەزیم ڕەزایی

٢ ل ٢٦١ کتێبی «پژوهشی در اساطیر ایران»، مێهرداد بەهار

# خۆشێنان

**خوشینان** **Xuşînan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خورخورەی سەقز. ٢٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٢٣ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(خۆشێن؛ خۆشین: نازناوی موبارەکشای ئەهلیهەقە ف لقب مبارکشاه اهل حق) + (ان: نیشانەی کۆ ف علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** هۆگران و لایەنگرانی شاخۆشینی ئەهلی حەق ف پیروان و هواداران شاەخوشین اهل حق.

لە کۆتایی ساڵانی سەدەی چوارەمی کۆچی مانگی (١١٠٠ی زایینی) موبارەکشای ناسراو بە شاخۆشین لە لوڕستاندا سەری هەڵدا و پەرەی بە ئایینی حەقیقەت دا لە بەشێک لەو هەرێمە. هۆگران و لایەنگرانی موبارەکشا، ڕوخساری ئەم ڕێبەرەیان بە ڕوخساری خودا (مەزهەرەڵڵا؛ مظهرالله) دەزانی و دەیانگوت کە لە دایکێکی باکیرە (نەشەمزاو و دەست لێنەدراو) لە دایک بووە و نێوی مامەدجەلالە بووە.

موبارەکشا پیاوچاک و ساڵح بووە و لە ماوەیەکی کەمدا هۆگر و ڕێڕەو و لایەنگرانێکی زۆری لە دەور کۆ بۆتەوە. شاخۆشین لە لوڕستانەوە چووە بۆ هەمەدان و چاوی بە باباتاهیری هەمەدانی (عوریان؛ ڕووت)ی شاعیر

---

١ ل ٧١٧ شانامەی فیردەوسی

کەوتووە. پاشان ڕێی کرماشانی گرتۆتە بەر، بەڵام مردن مەودای نەداوە و لە دەوروبەری هەرسینی کرماشان لە ڕووباری گاماسیاودا خنکاوە.[1]

دەبێ بزانین موبارەکشا لە ناوچەکانی شنرویی شیو و دۆڵەکانی خۆشیندا پەروەردە بووە. چۆمی شنروێ کەوتۆتە پشتی سەرچاوەی زەڵم.[2]

پێموایە نێوی ئەم دێیە لە شاخۆشین وەرگیراوە و ڕەنگە بە هۆی شێخەکان و ڕێبەران و لایەنگرانی ئەو تەریقەت و ڕێبازەوە نێوی خۆشێنیان لە سەر دانابێ.

---

١ ل ٣٢ کتێبی «مێژووی مۆسیقای کوردی»، محەممەد حەمەباقی

٢ ل ١٠٦ کتێبی «ڕەسەنایەتی زەمانەکەت بناسە»، محەمەدئەمین هەورامانی

# خورمتا

خرمتا **Xormta**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ٣٤ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣٧ کەسە.

ئەم وشەیە دوو بەشە و پێکهاتەیەکە لە دوو وشەی کوردی و سومێری:

(خـور: خـۆر؛ ڕۆژ؛ هەتـاو؛ تـاو؛ هـور؛ خورشـید؛ آفتـاب) + (متـا؛ مـاتۆ: وڵات؛ ناوچە؛ شوێن؛ محل؛ مکان؛ سرزمین)[1]

مانـای وشـەکە دەبێـتە: وڵاتـی خـۆر؛ وڵاتـی ڕۆژ؛ سـرزمین خورشـید؛ سرزمین نور و روشنایی

ئەم پێکهـاتەیە نێـوی دوو شـوێنی نزیکـی شـاری کەرکـووکە: دووزخورمـاتوو؛ تازەخورمـاتوو). "خورمتـا"ش هەر خورمـاتووە کە پیتەکـانی پاش و پێشیان پێ کراوە.

لە لاپەڕەی ٢٥٩ی کتێبـی مێـژووی مـادی دیاکۆنۆفـدا باسـی وشـەیەک کراوە بە نێوی "دێی ئورمیاتە" Urmyata. کە لە هێرشێکی ئاشووریەکان بۆ سـەر دەوڵەتـیماننا گەمـارۆ درابوو. گودار پێیوایە ئەم ئورمیـاتەیە ئـاوایی

---

١ بە پێـی کتێبـی «لێکۆڵینەوەیەکی زمـانەوانی دەربـارەی مێـژووی وڵاتـی کـوردەواری» نووسـینی دوکتۆر جەماڵ ڕەشید ئەحمەد، لە زمانی سومێریدا، ماتۆ بە مانای وڵات و سەرزەمینە.

ساحێبی سەقزە[1]. بەڵام من ئەو وشەیە بە نێوی دێی خورمتای سەرشیوی سەقز دەزانم کە لەسەرەوە باسمان کرد. (ئور: هوور؛ خور ف خورشید) + (میاتە؛ ماتۆ؛ متا: وڵات ف سرزمین) کە هەر دەبێتە خورمتا یا وڵاتی خۆر؛ وڵاتی ڕووناکی. بە بڕوای من ئەو دێیە و نێوەکەی زۆر کۆنن و دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی بڕوا بە ڕۆژ و هەتاو و مێهر و میترا و میتراییسم.

---

١ ل ـ ز کتێبی «الواح بابل»، نووسینی ئێدوارد شی‌یرا، ئاغای ئاندرەگودار لە ساڵی ١٩٢٩ی زایینی بوو بە مودیرکوللی «امور عتیقات» و دەستی بە کار کرد. گودار زانایەکی فەرانسەیی بوو.

# خوردەلووکی

**خُردَه لوکی** **Xorde lûkî**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ١٠٥ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٤١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** وشەکە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(خـوردە: ورد؛ بوچک؛ بچـووک؛ چکۆلەفریـز؛ خـرد؛ کوچـک) + (لـووک؛ لۆک: وشتر؛ وشتری نێرفشتر؛ شتر نر) + (ی: یای نیسبەتفیاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** وشـتری چکۆلە؛ وشـتری نێری بچـووکف شتر کوچک

* لە وشەی "خوردە" لە زمانی تورکیدا بۆ نێو کەڵک وەرگیراوە:

ـ لە شـاری "میـانە" دێـیەک هەیە بە نێـوی خـوردەبلاغ: کـانیە بچکـۆلەف چشمەی کوچک

* بـۆ نێـوی ژنـانی تـورک بەکـاردێ: خوردەخـانم: خـانمەچکۆلفخـانم کوچک

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(خــوردە: ورد؛ چکــۆلەفریــز؛ خــرد؛ کوچــک) + (لــووکی[1]: چەشــنێ خواردمەنی کە لە ئاردی برینج و شیر و شـەکر و کەرە دروست دەکرێف

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

نوعی خوراکی که از آرد برنج و شیر و شکر و کره درست می‌شود و در صبحانه به جای نان می‌خورند.)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کولێرەی چکۆلە؛ نانبرینجی چکۆلە؛ کولێرەناسکە ف نان‌برنجی کوچک؛ گردەنان کوچک

# خوڕخوڕە

**Xurxure** **خورخوره**

دێــیەکە ســـەر بە نــاوچەی خوڕخــوڕەی ســـەقز. ٥٦ مــاڵە و ژمــارەی دانیشتووانی ٢٦٣ کەسە.

ئەم وشەیە کوردی؛ پەهلەویە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(خوڕ؛ خۆر: هەتاو؛ تاو؛ ڕۆژ|ف|هور؛ خور؛ خورشید؛ آفتاب) + (خوڕە؛ خورە: ڕووناکی؛ تیشک؛ ماڵ و سامان؛ کاری چاک؛ خۆشبەختی و هات؛ فەڕ؛ شکۆ؛ جەلال|ف|فر؛ شکوە؛ جلال؛ سعادت؛ روشنایی و نور ساطع از ذات الهی)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ڕووناکایی و تیشکی خۆر؛ شان و شکۆ و نووری خۆر|ف|روشنایی و نور خورشید؛ شکوه و جلال و نور خورشید

ئەم نێوەش هەروەک چەند نێوی دیکە (تاویشە؛ خورمتا؛ خەییەر و...) دیاردە و ئاماژەیەکە بە بیر و باوەڕی خەڵکی ناوچەکە بە ئایینی میتراییسم بەر لە ئایینی مەزدەیەسنا (ئایینی زەردەشتی).

ـ لەبەر ئەوەی زۆرتر لەگەڵ وشەی "خورە" ئاشنا بین، پێویستە ئەو چەند ڕستەیەی خوارەوە بخوێنینەوە: خورە تیشک و نوورێکە لە لایەن یەزدانەوە دەدرێ بە مـرۆڤ. لەو ڕوونـاکیە ئەوەی کە تـایبەتیە دەدرێ بە شایانی گەورە و دادپەروەری جیهان. ئەم وشەیە لە زمانی پەهلەویدا پێی دەڵێن "خورە" و لە زمانی پارسی کۆنیشدا پێی کوتراوە "فەڕنە" و لە

---

١ ل ٣٧١ سەفەرنامەی «ابن حوقل»

فارسیشـدا پێـی دەڵـێن "فەڕ؛ فـر؛ خـورە". ئەم وشـەیە لە زمـانی کوردیـدا بە فـۆرمی "فەڕ" هەیە. فەڕ یـانی ودم؛ بەهـرە؛ پیـرۆزی و موبـارەکی[فا]مبـارکی؛ هـودە؛ فایـدە. بە مرۆڤـی بێکـار و بێفایـدە و شـەڕودڕ دەڵـێن "بەدفەڕ". لە ئاوێستادا باسی دوو چەشنە خورە کراوە: ١ـ خورە یا فەڕی ئێرانی کە ئەم تیشـکە دەبێـتە هـۆی گەورەیـی و دەوڵەمەنـدی و سـامانداریێتی ئێـران و تێکشکانی غەیرە ئێرانیەکان و دوژمنەکانی ئێران ٢ـ خورە یا فەڕی کیانی کە ئەم تیشکە دەبێتە هۆی سەرکەوتن و بە پادشا بوونی گەورەپیاوانی وڵات. ئەهورامەزدا هەتا ڕۆژی هەستانەوە (پەسڵان) ئەم تیشک و ڕووناکی و فەڕە بۆ ئێرانییەکان ڕادەگرێ و سوشیانت (بە بڕوای زەردەشتیەکان ئەو کەسـەی لە ئاخرزەمانـــدا دێ) ئەو فەڕی ئیـــزەدیەی پـــێ دەدرێ و لە کەنـــار و دەوروبەری گـۆلی هـاموون سـەر هەڵـدەدا و دونیـا پـڕ دەکـا لە ڕاسـتی و دادپەروەری.[1]

ـ لە جێیەکی تردا ئاوا باسی خورە کراوە: ڕووناکییەکی ڕوحییە کە لە هەنـاوی مرۆڤـدایە کە دەبێـتە هـۆی سـەرکەوتن و بەرەو پێشـەوە چـوونی مـرۆڤ. ئەم وشـەیە لە سـەفەرنامەی (ابـن حوقـل) لاپەڕە ٣٧١ و (شـانامەی فیردەوسـی)دا بە چەشـنی خـورە ئەردشـیر یـا ئەردشـیرخورە باسـی کـراوە. ئەردشیرخورە ئێستا شاری فیرووزئابادی ئوستانی فارسە.[2]

ـ لە ئاوێسـتادا باسـی شـەش کەرەسـە یـا ئـامرازی ناسـین وەیـا توانـایی شاردراوە (بالقوه) کە پێکهێنەری شەخسیەت و کەسایەتی و هۆویەتی مرۆڤن کراوە: ١ـ مەنە: مَنَ ٢ـ دەئێنا: دَانا ٣ـ ئەهـوو: اَهُو ٤ـ خـوارنە: خـورە؛ فەڕ. خـورە یا فەڕ ڕووناکیەکی مینوویی یا ڕوحییە کە لە هەناو و دەروونـی مرۆڤدایە ٥ـ بئوودا ٦ـ فەرەوەشی؛ فرەوشی.[3]

---

١ فەرهەنگی دێهخودا

٢ ل ٦١ و ٦٢ کتێبی «دیدی نو از دینی کهن»، نووسینی فەرهەنگی فەرەوەشی

٣ ل ٩٠ تا ٩٣ی کتێبی «دیدی نو از دینی کهن»

ـ وشـەی خـورە لە عەرەبیـدا کـراوە بە "کـورە" و مانـای سـەرەکیەکەی سەعادەت و خۆشبەختی و ماڵ و سامان و گەورەیی و شـان و شـەوکەتە[1]. ئەم وشـەیە موجـازەن مانـاکەی بـووە بە «نـاحیە؛ نـاوچە؛ مەڵبەنـد» کەوابـوو دەبێتە (کـوورە: وڵات؛ شارسـتان؛ فەڕ؛ گەورەیـی و شـان و شـکۆ و جەلال و جەبەڕووت)

* چەند جێ بە نێوی خورخورە هەیە. وەک:

- دێی خورخورەی نزیک گوندی گابازەڵە لە باشووری گۆلی ورمێ سـەر بە شاری مەهاباد.

- دێی خورخورە نزیک گوندەکانی زێراندۆڵ و سـلامەت سـەر بە شـاری بۆکان

- دێی خورخورە سەر بە شاری بیجار لە سەر ڕێگای بیجار؛ زەنجان.

- دێی خورخورە سەر بە شاری ئێلخچی نزیک شاری تەورێز

بۆچـوونی **دووهەم**. زۆر کەس پێیـانوایە وشـەی خورخـورە لە خـورەی ئـاو و چـۆم وەرگیـراوە یـانی ئەم وشـەیە دەنگـی هەرا و هـاژەی ئـاوە. ئەم لێکدانەوەیە تێڕوانینێکی سەرسـەرەکی و ڕواڵەتی و هەڵەیە.

* خورخـورە لە شـیعرێکی شـاعیری بەناوبـانگی کـورد "حەریـق"دا بەم شێوەیە هاتووە:

خەت و مۆری زوڵف و خاڵت، حوججەتی موڵکی دڵە
نەقشی ئەو مۆرە بە ئاوی خورخورە ناچێتەوە

---

١ ل ٣٧١ سەفەرنامەی «ابنحوقل»

# دەئاخڵڵ؛ دەگاخڵڵ

**درگاه خلیل** **Daxlil**

ئەم دێیە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕەیە. ئاواییەکی چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی و تەنیا مەزرایەکە.

بۆ لێکدانەوەی وشەی دەئاخڵڵ چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەئا: دەگا؛ دێ؛ ئاوایی؛ گوند[ف] آبادی؛ روستا؛ دە) + (خڵڵ: خەلیل؛ ناوە بۆ پیاوان[ف] خلیل؛ نامی برای مردان)

**مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** دێی خەلیل؛ ئاوایی خەلیل[ف] آبادی خلیل؛ روستای خلیل

دەبێ ئەوە بزانین «دایە؛ دەئا» هەر دەگایە: کە لە ئاخاوتندا پیتی «گ» ناخوێندرێتەوە.

**دووهەم**. وشەی خڵڵ عەرەبییە:

لە فەرهەنگی «المحیط فیروزآبادی»دا خل (خلل) بە سرکەی دروستکراو لە ترێ «هەنگوور» گوتراوە.[1] ئەم وشەیە لە ئینگلیسیدا vinegarی پێ دەڵێن. بنەڕەتی ئەم وشەیە ئەکەدییە.

**سێهەم**. وشەی خڵڵ لە یەکێ لە دەقەکانی مێژوویی کۆندا کە پێوەندی لەگەڵ دکتۆری ددان «ددانپزشکی» هەیە باسی کراوە. لەم دەقەدا خڵڵ بە مانای (بخور الالهه) بخووری ئیلاهی؛ بخووری خوداییە.[1]

---

١ ل ٨٠ کتێبی (فرهنگ واژگان اکدی)، موحەممەد داوود سەللوم - وەرگێڕ: نادر کەریمیان سەردەشتی

بخـوور مـادەیەکە ئـاوری بـدەی بـۆنێکی خۆشـی لـێ هەڵدەسـتێ. وەک بخـووری مەریەم؛ بخـور الاکـراد؛ بخـور السـودان؛ بخـور البـر؛ بخـور البربـر. ئەوانە گیایەکن کە بۆ جوانی یا بۆ کاروباری پزیشکی دەچێندرێن.

من پێموایە بخور الاکراد هەر گیای «خەرپنگ، خەربەنگ، بذر البنج»ە کە لە کوردەواریدا بۆ ددانئێشە کەڵکی لێ وەرگیراوە.

---

١ سەرچاوەی پێشوو.

# داشاڵووجه

**داشالوجه** **Daşalûce**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. کەوتۆتە ژێر ئاوی سەدی بۆکان و چۆڵ کراوە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(داش: بەرد؛ کوچک » سەنگ ف سنگ) + (ڵوو: لوو؛ پاشگری نیسبەتە لە تورکیدا: شوێن؛ جێ؛ خاوەن ف پسوند نسبت؛ دارندە؛ مکان) + (جە: نیشانە و عەلامەتی چکۆلە کردنەوە لە تورکیدا؛ چکۆلە؛ بچووک ف علامت تصغیر در زبان ترکی؛ کوچک؛ ریز)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شوێنەی وردەبەردی لێیە ف مکانی با سنگریزەهای زیاد

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە:

لەم چەشنە وشانە کە «داش» و وشەیەکی دیکە تێکەڵاو دەبن، زۆرە. وەک:

ـ داشکەلەم: کەلەمی ڕەق وەک بەرد ف کلم قمری؛ کلم سنگی[١]

ـ داشئارموود: چەشنێ هەرمێی ڕەق کە درەنگ پێدەگا؛ دێرڕەس ف نوعی گلابی دیررس و سفت؛ گلابی سنگی[٢]

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

وشەی داشاڵووجەش، وشەیەکە وەک ئەوانە لە سەرەوە باسمان کردن. لە دوو بەش پێکهاتووە:

(داش: بەرد؛ سەنگ) + (ئاڵووچە:هەڵووچە ف آلو؛ گوجە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** هەڵووچەی بەردین یان هەڵووچە و قەرەڵووی ڕەق و دێڕڕەس.

# دالوو

**دالو** **Dalû**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٣١ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١٨٤ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە سێ بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. وشەکە تورکییە:

(دالوو؛ دالّی: پشتەوە؛ پێشەوە ناف پشتی؛ عقبی)

لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەو دێیە لە پشتەوە هەڵکەوتووە و لە ڕوونییە و شاردراوەیە. دژی ئەم وشەیە دێیەک هەیە بە نێوی قەبەغڵوو کە ماناکەی (لە پێشەوە؛ لە ڕووە و دیار)ە.

**دووهەم**. ئەم وشەیە لە نێو مەغوولەکاندا نێوی پیاوانە. وەک:

ـ ئوولووک بەهادور و "تغای دالوو" لە ئێلی جوورپیات و خەڵکی ئەو ئێلە بە یەکەوە هـاتن بـۆ لای چەنگیزخـان هەتـا تەسـلیم بـن و گـوێڕایەڵی خۆیـان ڕابگەیەنن.[1]

**سێهەم**. وشەکە تورکییە و ماناکەی ئاوایە:

(داللی؛ دالوو؛ پڕ لقوپۆپ؛ چڵوچێوی زۆرف پر شاخ و برگ؛ شاخەدار)[2]

مەبەست ئەوەیە ئەو دێیە دارستانی زۆرە و چڕوپڕە لە دار.

---

١ ل ٢٢٥ کتێبی «جامع التواریخ» نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵلا

٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# دایەسلێمان

**درگاه سلیمان** **Daye sleman**

ئەو دێیە سەر بە ناوچەی ساحێبە. ٧٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٣٧ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی وشەی دایەسلێمان دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە ولە دوو بەش پێکهاتووە:

(دایە: دەگا؛ دێ؛ ئاوایی؛ گوند ف دە؛ آبادی) + (سلێمان: نێوی پیاوانە ف نامی برای مردان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دێی سلێمان؛ ئاوایی سلێمان ف دە سلیمان؛ آبادی سلیمان

هۆی ئەوەی بەم ئاواییە دەگوترێ «دایەسلێمان» ئەوەیە کە لەم چەشنە نێوانەدا پیتی "گ" ناخوێندرێتەوە و لە جیاتی ئەوەی بڵێن "دەگا" دەڵێن "دئا" هەر ئەوەش بۆتە هۆی هەڵە کردن.

لەم چەشنە چەند شوێن هەیە. وەک:

- ئاوایی دەگاگا لە سەرشیوی سەقز
- ئاوایی دەگاخڵێ لە خوڕخوڕە
- دگاسیاب لە شاری پاوە
- دگاگا لە شاری پاوە
- دگاگا لە شاری سەروئاباد (سەوڵئاوا)
- دگایران لە شاری سنە

هەروەک دەزانین لە کۆندا نێوی "ڕەی؛ ری" نزیک تاران "ڕگا" بووە و ئێستا "گ"یەکەی ناخوێندرێتەوە و ئەم وشەیە لە ڕاستیدا هەر ڕێگای کوردییە.

**دووهەم**. هەندێ کەس بە هەڵە پێیانوایە ئەم وشەیە «دایەسلێمان» یانی «دایکی سلێمان»ە و هەروەک ئاماژەمان پێکرد بۆچوونەکە هەڵەیە.

# دەرەتفێ

**دَرَەتْفی** **Deretifê**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕەی سەقز. ٣٥ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٩٢ کەسە.

وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەرە: دۆڵ؛ شیو ف درّە) + (تفێ: تووی شیرن لە هەورامیدا؛ داری تووشیرین؛ توت شیرین)

مانای وشەکە دەبێتە: دۆڵ و دەرە و شیوێکی داری تووشیرینی لێیە ف درەای کە دارای درختان توت شیرین است.

# دەرەهوان

**Dere hwan** **دَرَه هوان**

دێیەکە سەر بە ناوچەی چلچەمەی خورخورەی سەقز. ٥٢ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦٩ کەسە.

لە گازەکانی ئاوێستادا (گاتاکان؛ گاسەکان) سێ دروشمی بەنێوبانگ هەیە کە بەم چەشنەی خوارەوە دەخوێندرێنەوە:

هوومەتە: Humete بیروبڕوای چاکفپندار نیک

هووەختە: Huvexte وتەی چاک؛ گفتار نیک

هوووەڕەشتە: Huvereşte کردەوەی چاک؛ کردار نیک[١]

لە ئاوێستادا وشەیەکی دیکە هەیە: هوگئو؛ هووگائوو (مانگای چاکفگاو خوب).

هەروەک لە سەرەوە دیمان لە هەموو وشەکاندا «هوو» بە مانای «چاک؛ خوب»ە.[٢]

ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا فۆرمێکی دیکەی وشەی «خووب»ە کە بووە بە «خوو؛ هوو». ئەم ئاڵوگۆڕ و سووانەش کارێکی ئاسایییە وەک:

خوون ← هوون

خونەک ← هۆنک؛ فێنک

---

١ ل ٢٩٥ کتێبی «زرتشت» نووسینی جەلالەدینی ئاشتیانی

٢ ل ٣٥٤ کتێبی «تاریخ ماد» نووسینی دیاکۆنۆف

خەون ← هۆون

خانە ← هانە؛ هوونە[١]

وشـەی «دەرە هـوان» وشـەیەکی کـوردی؛ ئاوێسـتاییيە و لە سـێ بەش پێکهاتووە:

(دەرە: دۆڵ؛ شـیوفدرە) + (هـو: چـاک؛ خـاسفخـوب) + (ان: نیشـانە و دیاردەی کۆفعلامت جمع)

**مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** شـیوی چاکـان؛ دۆڵ و دەرەی خاسـانف درەی نیکان.

١ ل ٩٦١-٩٦٠ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# دەگاگا

**Degaga** **دَگاگا**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٦١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٦٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەگا: دێ؛ ئاوایی؛ گوندفدە؛ آبادی؛ روستا) + (گا: گاە؛ شوێن؛ جێفگاە؛ محل؛ مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنی ئاوایی؛ جێ و شوێنێکی ئاوەدان بێ و ئاوایی لێ بێفجایگاە دە؛ محلی کە روستا در آن قرار دارد.

لە چەشنی وشەی دەگا، وشەی ڕەگا هەیە کە لە کۆندا نێوی شاری ڕەی نزیکی تاران بووە. هەرئێستاش ئەم وشەیە لە موکریان باوە و بە "ڕێ" دەڵێن "ڕێگا".

وشەی "گا"ش لە زۆر وشەدا دەبیندرێ. وەک: ئاورگا؛ ئۆردووگا؛ قەڵاگا.

# دۆمان

**دومان** **Doman**

ئـاوایییەکی چـۆڵکراوە. ئەم شـوێنە لە نزیـک چـۆمی جەغەتـوو و دێـی عەسراباد (عصرآباد) هەڵکەوتبوو.

لە بابەت ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دۆم: ١ـ هـۆزێکی کـۆچەری کـوردە ٢ـ فێڵەبـاز ٣ـ دایـم؛ هەمیشـە ٤ـ دەهۆڵزەن ف از طوایف کوچرو کرد ٢ـ حقەباز ٣ـ دایـم؛ همیشـه ٤ـ دهـلزن) + (ان: نیشانەی کۆ ف علامت و نشانەی جمع)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دۆمەکان ف دومها؛ دومان؛ کولی‌ها

ئەو هۆز و تایفەیەی لەم شار بۆ ئەو شـار دەگەڕێن و ژیـانی خۆیـان لە ڕێـی فرۆشـتنی بێژنـگ و کەو و شـەنە و چەنـد شـتی دیـکە بەڕێـوە دەبەن، دۆمیان پێ دەڵێن.

**دووهەم**. ئەم وشەیە تورکییە:

(دۆمان: تەم؛ مژ؛ مژی چڕ؛ هەڵم؛ هەور؛ دووکەڵ؛ تەپوتـۆز ف مـه غلیظ؛ مه؛ بخار؛ ابر؛ گرد و غبار؛ دود)[2]

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

هـۆی نێونـانی ئەم دێـیە بە تەپـۆمـژ و هەور و هەڵا ئەوە بـووە کە لە کەناری چۆمی جەغەتوو هەڵکەوتبوو.

**سێهەم.** وشەکە تورکییـە: (دۆمـان[1] ئیسـتلاح یـا وشـەیەکی بـاوی تورکییـە کە هاوتای «آقیای قورچیسی ـ oqyay qurchisi»یە.) وەزیفە یا ئەرکی ئەم پیاوە، ڕاگرتنی تیر و کەوانی شا بووە وظیفـەای او را «نگهداری تیر و کمان شاه» دانستەاند.

---

١ ل ٨٦ کتێبی «تذکرة الملوک» ـ نووسینی میرزا سەمیعا ـ دوکتۆر محەمەد دەبیرسیاقی ساغی کردۆتەوە.

# دەورەقەڵا

**دولت‌قلعه** **Dewre qela**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خورخورە. ١٠٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٥٧ کەسە.

بۆچوونی یەکەم. وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەورە: دیـوار، حەسـار، شـوورە ف دیـوار، حصـار، بـارو) + (قەڵا: خانووبەرەی چەکداران لە سەر کێو، ماڵی ئاغا، بورج، قەسر، دژ، کەلات ف قلعه، کلات، برج، دژ)

**واتای تێکڕای نێوەکە دەبێتە:** قەڵایەکی دەوری بە دیوار گیراوە؛ ئەو دژ و قەڵایەی دەوراندەوری دیوار کێشراوە ف قلعەای کە چهار دورش را دیوار فرا گرفتە است.

**بۆچوونی دووەم.** ئەم نێوە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەورە: گەمارۆ، محاسرە، چوار لا گرتن، دەورگیران و دەور گرتن ف محاصرە، احاطە، در حلقە قرار دادن، دور چیزی را گرفتن) + (قەڵا: کەلات، ماڵی ئاغا، خانووبەرەی چەکداران لە سەر کێو ف دژ، کلات، برج، قلعە)

**واتـای تێکـڕای وشـەکە دەبێـتە:** قەڵای دەورگیـراو، قەڵای گەمـارۆدراو، قەڵای محاسرە کراو ف قلعە محاصرە شدە، برج و دژ در محاصرە

دەکرێ بڵێین هۆی ئەم نێونانە ئەوە بێ کە کاتی خۆی ئەم قەڵایە لە لایەن نەیاران و دوژمنانیەوە گەمارۆ درابێ و لەم گەمارۆ و محاسرەیەدا سەربەرز دەرچووبێ و هەر ئەوە بووبێتە هێما و نیشانەی سەرکەوتن و نێوی دێیەکەشیان بە نێوی ئەو قەڵایەوە کردبێ.

**بۆچوونی سێیەم.** وشەیەکی کوردییە ولە دوو بەش پێکهاتووە:

(دەورە: ڕۆژگار، زەمانە، سەردەم ف روزگار، عصر و زمانە، دورە) + (قەڵا: دژ، ماڵی سەر کێو، ماڵی ئاغا، قەسر ف دژ، برج، قصر، کلات)

**کەوابوو مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** قەڵای شیاوی دەورە و زەمانە، قەڵای سەردەم ف قلعە مناسب دور و زمانە، قلعە عصر، قلعە نوین

مەبەست ئەوەیە ئەم قەڵایە بابەت و شیاوی ئەم دەور و زەمانەیە دروست کراوە. یا قەڵایەکە سەردەمیانە دروست کراوە لە بواری کەرەسە و نەخشە و هەموو ئەو شتانەی پێوەندی بە دروست کرانی قەڵاوە هەیە.

لە نووسینی ڕەسمیدا دەنووسرێ «دولت قلعە» یانی قەڵای دەوڵەت و دەسەڵات کە بە تەواوی هەڵەیە و هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ دەوڵەت نییە.

* لە نزیک ئاواییەکانی چەرخەڵان و ئاسماندۆڵی شاری سونقوری پارێزگای کرماشان، کێوێکی لێیە بە نێوی دەورەقەڵا.

**بۆچوونی چوارەم.** دەتوانین بڵێین چوار دەوری ئەو دێیە قەڵا بووە. یانی دێیەک بووە لە نێو قەڵادا دروست کراوە. بەم بۆنەیەوە پێیان کوتووە دەورەقەڵا.

# داراوێ

**دارابی** **Darawê**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ١٧ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم نێوە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە فارسی‌یە «دارابی»:

(دارابی: ١. نێوە ٢. ئاوەڵناوی نیسبەتە «صفت نسبی»، بە کەسێک دەڵێن خەڵکی داراب بێ کە شارێکی ئوستانی فارسە ٣ـ میوەیەکە وەک نارنج و پرتەقاڵ، خڕ و گەورە و نارنجی ڕەنگە و تامی ترش و شیرینە «مزرە». ف ١. اسم ٢. صفت نسبی، شخص منسوب بە شهر داراب استان فارس ٣ـ میوەای است از جنس مرکبات شبیە نارنج و پرتقال با طعم ملس «ترش و شیرین»)

لە ڕووی ئەم مانایانەوە دەتوانین بڵێین: ١ـ پیاوێکی خەڵکی داراب ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە ٢. میوەی دارابی لەوێ زۆر بووە، بەم بۆنەیەوە دێیەکەیان نێو ناوە دارابی ف ١. اهل داراب محل مذکور را آباد کردە است ٢ـ در محل درخت دارابی فراوان بودە است.

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە:

(دارا: نێوە بۆ پیاوان، بە کەسی ماڵدار و دەوڵەمەند دەڵێن ف نامی برای مردان، مالدار، ثروتمند، دارندە) دارا بۆ یەکەم جار بە داریووشی گەورە، شای هەخامەنشی گوتراوە. ئەم دارایە هەمان داریووشی یەکەمە. + (وێ: ئەوێ، ئەو جێگایە ف آنجا، آن محل)

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** جێ و شوێنی دارا ف مکان و محل "دارا".

دەتوانین بڵێین بۆ یەکەم جار پیاوێک بە نێوی دارا ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە. ف برای اولین بار شخصی به نام دارا این محل را آباد کرده است.

**سێهەم.** وشەکە کوردییە و واتاکەی (داراب: خودا و ڕەببی ئاوە ف رب آب است که پرورنده و رب النوع خوانند.) + (ی: یای نیسبەتە ف یای نسبت)

**واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شوێنە هی خودایە. ئەو جێیە هی ڕەببە ف این مکان مال خداست.

هەروەک دێی «خولامالی = ماڵی خودا ف خانه خدا» کە دێیەکی سەر بە ناوچەی تورجانە.

**چوارەم.** وشەیەکی فارسی ـ کوردییە:

(داراب: میراو، کەسێکی ئاوی هەیە و ئاو دەدێرێ؛ نیگابان و چاوەدێری ئاو؛ کەسێکی بە نۆرە ئاو بە سەر مەزرا و ماڵەکاندا بەش دەکا. ف میراب، کسی که آب را بر خانه‌ها و کشتزارها تقسیم می‌کند، نگهبان آب، آبیار) + (ی: یای نیسبەت ف یاء نسبت)

**واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شوێنە سەر بە میراوە، ئەم جێیە هی میراوە ف این مکان منسوب است به میراب.

**پێنجەم.** وشەیەکی کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(دار: درەخت، چێو؛ خاوەن «وەک: خێزاندار، مەڕدار» ف درخت، چوب، هیزم؛ صاحب، دارنده) + (ئاو: مادەیەکی شلی بێ بۆنی بێتام و ڕەنگە، لە بەشێک ئۆکسیژێن و دوو بەش هیدرۆژێن پێکهاتووە. گیانی هەموو بوونەوەرێک بە ئاو بەندە ف ماده‌ای بی رنگ و بو و طعم، تمام موجودات به

آن زنده‌انــد.) + (یَ: له ڕاســتی‌دا «وێ» بــووه که له‌گه‌ڵ «واو»ی وشــه‌ی پێشوو «ئاو» تێکه‌ڵاو بووه ف در اصل «وێ» بوده است)

**که‌وابوو واتای سه‌رجه‌می وشه‌که ده‌بێته:** شوێنی دار و ئاو؛ جێیه‌کی دار و ئاوی لێیه ف مکان و محلی که آب و درخت دارد.

به پێکهـاته‌ی «دار» و «ئـاو» ده‌یه‌وێ نیشـانی دا که ئه‌و شـوێنه دار و ئاوی هه‌یه و سه‌وزه‌ڵانی و خۆش و زه‌مه‌نده.

**شه‌شه‌م.** ده‌کرێ بڵێین ئه‌و شوێنه داری زۆر لێ بووه یانی داراوی بـووه که به مانی ئالووده به داره. وه‌ک شیلاناوی یـانی شـوێنێکی شیلانی زۆر لـێ بووه.

# ڕەنگەڕێژان

**ڕَنگَریژان** **Rengerejan**

ئـاواییەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ٧١ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٠٠ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم. وشەیەکی کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(ڕەنگ: چۆنیەتی دیمەنێک لە شتێک کە دێتە بەرچاو وەک سپی، زەرد، سوور ف نمود اشیاء بر اثر بازتاب نور از آن‌ها؛ مادەای تهیه شده از مواد معدنی گیاهی یا روغنی کە برای رنگ‌آمیزی یا نقاشی بکار می‌رود) + (ڕێژ: ڕێژتن؛ ڕێژان؛ گرتنەوەی ڕەنگ و ڕەنگ کردنی ئەو شتانە پێویستە ڕەنگ بکرێ؛ خومگەری؛ خومگەر ف ریختن؛ رنگرزی؛ رنگ کردن؛ رنگرز) + (ان: ئەلف و نوونی نیشانەی کۆ ف علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** خومگەران؛ ئەو کەسانەی ڕەنگ دەکەن؛ ئەوانەی کار و پیشەیان ڕەنگکردنی بەن و جل و شتی وایە ف رنگرزان؛ کسانی کە کارشان رنگرزی است؛ رنگرزی؛ کسی کە پیشەاش رنگ کردن نخ، پارچە، جامە و امثال آن باشد؛ صباغ.

بۆچوونی دووهەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ڕەنگەڕێـژە: ڕەنگـاڵە؛ مێشخـۆرە؛ ڕەنگرێـژە؛ هەنگەچیـنە؛ هەنگەخـۆرە؛ کەندەسمە[1] ف پرنـدەای اسـت رنگارنـگ؛ شـکارچی زنبورعسـل؛ سـبزقبا) + (ان: نیشانەی کۆ ف علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ڕەنگاڵەکان؛ مێشخۆرەکـان؛ هەنگەچینەکـان ف پرندگان رنگارنگ شکارچی زنبورعسل.

لەوە دەچێ بە بۆنەی ئەوەی ئەو ناوچەیە هەنگەخۆرەی زۆر بـووە، دێی ڕەنگەڕێژانیـان بەو نێوەوە کردبـێ. لەم چەشـنە دێیەکـی دیکەش لە نـاوچەی سەرشیو هەیە بە نێوی هەنگەچینە.

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# ڕۆستەمەکوڕ

رستم کُر **Rosteme kur**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕەی سەقز. چۆڵ کراوە و کەسی تێدا ناژی، بەڵام هاوین و بەهار کشتوکاڵی تێدا دەکرێ.

ئەم وشەیە کوردییە ولە سێ بەش پێکهاتووە:

(ڕۆستەم:[1] پاڵەوانی بەهێز و دلێر. گەورەترین پاڵەوانی ئەفسانەیی ئێرانە کە لە شانامەی فیردەوسیدا بە تێروتەسەلی باسی ئازایەتییەکانی کراوە. نێوی ژنی ڕۆستەم تەهمینە بوو. ئەو دووانە کوڕێکیان بوو بە نێوی سۆهراب «زۆراو». دواتر ڕۆستەم بێ ئەوەی بزانێ ئەو کەسەی لەگەڵی بە شەڕ دێ کوڕیەتی، کوشتی و کارەساتێکی دڵتەزێنی خوڵقاند. ڕۆستەم بەرەنگاری زۆر کەس بوو و دەیان ئازایەتی تۆمار کرد.) + (ە: های نیسبەت و پێوەند ف های نسبت و پیوند) یانی دەتوانین بڵێین ئەو هایە نەخشی کەسرەی هەیە + (کوڕ: منداڵی نێرینە، بەرانبەری مێوینە ف فرزند نرینە، مقابل مادە)

**کەوابوو واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کوڕی ڕۆستەم، زۆراب یا سۆهراب کوڕی ڕۆستەم ف پسر رستم، سهراب فرزند رستم

مەبەست ئەوەیە ئەو کەسەی توانیویەتی یا وێراویەتی ئەو شوێنە شاخ و داخە ئاوەدان بکاتەوە و تێیدا بژی، وەک کوڕی ڕۆستەم ئازا و پاڵەوان و بەجەرگ بووە.

---

١ ل ٦٩ و ٧٠ و ٧١ کتێبی «فرهنگ الفبایی موضوعی اساطیر ایران باستان» نووسراوەی مەلیحە کەرباسیان

له بۆچوونێکی دیکەدا دەتوانین بڵێین «ڕۆستەمەکوڕ» یانی کوڕی وەک ڕۆستەم ئازا و دلێر و نەبەز. ئەو کوڕە ئازایەی لە ڕۆستەم دەچێ، ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە. بۆیە دێیەکەیان بە نێوی ئەوەوە کردووە.

هەرلە ناوچەی خورخورەی سەقزدا دێیەکی دیکە هەیە بە نێوی ڕۆستەمان، کە واتاکەی کوڕی ڕۆستەم یا وەک ڕۆستم ئازایە. کە لەگەڵ وشەی ڕۆستەمەکوڕ یەک مانایان هەیە.

# ڕۆستەمان

**رستمان** **Rosteman**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمامی سەقز. ٤٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠١ کەسە.

**یەکەم**. ڕۆستەمان وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ڕۆستەم: پاڵەوانی ئەفسانەیی و بەنێوبانگی ئێران و کوڕی زاڵ. لە شانامەی فیردەوسیدا بە تێروتەسەلی باسی شەڕ و پاڵەوانی ئەو کەسایەتییە کراوە. کوڕێکی بوو بە نێوی سۆهراب «زۆراو، زۆراب» کە ئەویش پاڵەوانێکی گەورە بووە. لە شەڕێکی نەخوازراودا ڕۆستەم بێ ئەوەی بزانێ ئەو کەسەی لەگەڵی بە شەڕ دێ و بەرەنگاری بۆتەوە، زۆراوی کوڕیەتی، کوشتی و کارەساتێکی دڵتەزێنی خوڵقاند. ف رستم پهلوان افسانەای شاهنامە. شرح پهلوانی‌هایش در شاهنامه دیده می‌شود.) + (ان: ئەم ئەلف و نوونە، ئەلف و نوونی باوک و فرزەندییە کە پێی دەڵێن «ئەبووەت ـ ابوت». ئەلف و نوونی تەسنیە «تثنیە»شی پێ دەڵێن.[١] وەک:

قوبادان: کوڕی قوباد

کاوسان: کوڕی کاوس

ئەردەشیری بابەکان: ئەردەشیر کوڕی بابەک

---

١ ل ٣٤ کتێبی «چەمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان» نووسراوی سەید عەبدلحەمید توونداری، وەرگێڕ محەمەدی مەلا کەریم

کەوابوو **واتای وشەی ڕۆستەمان دەبێتە:** کوڕی ڕۆستەم، زۆراو کوڕی ڕۆستەم ف پسررستم، سهراب پسر رستم

لە ناوچەی خوڕخوڕە دێیەک هەیە بە نێوی «ڕۆستەمەکوڕ ـ رستم کر» کە هەر بە مانای کوڕی ڕۆستەمە و واتاکەیان لەگەڵ ڕۆستەمان یەکە.

**دووەم.** ڕۆستەمان وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ڕۆستەم: پاڵەوانی بەنێوبانگی شانامەی فیردەوسی ف پهلوان نامدار شاهنامه) + (ان: ئەلف و نوونی نیشانەی کۆ ف الف و نون نشانه جمع)

وەک یار: یاران * خوشک: خوشکان

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ڕۆستەمەکان، ڕۆستەمگەل، ڕۆستەمەیل ف رستمها، رستمان

دەکرێ بڵێن هۆی ئەم نێونانە ئەوە بووبێ کەسانی ئازا و دلێر و شەڕکەر لەم شوێنەدا ژیابن. خۆیان یا کەسانی دەوروبەر پێیان گوتبێتن: ئەوانە ڕۆستەمن، ئەوانە وەک ڕۆستەم ئازا و جەنگاوەرن. ف رستمها، شجاعان رستمآسا، پهلوانان رستمگون

**سێهەم.** وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ڕۆستەم: پاڵەوانی ئەفسانەیی شانامەی فیردەوسی ف پهلوان نامآور ایرانی) + (ان: پاشگر یا پاشوەندی جێ، شوێن ف پسوند مکان)

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** جێ و شوێنی ڕۆستەم ف محل و مکان و مسکن رستم

# زەمبیل

زَنبیل **Zembîl**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجانی سەقز. تەنیا ماڵێک لەوێ نیشتەجێیە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(زەم؛ زم؛ زۆم؛ زام: پێگەی هاوینی؛ هاوینەهەوار؛ ئێلاخ؛ سەرما؛ زۆزان پایگاه تابستانی؛ ییلاق؛ سرما؛ سردی؛ کوهستان)

لێرەدا بۆ نموونە چەند وشە کە سەرەتاکەیان «زم» یان فۆرمەکانی دیکەیە دەخەینە بەرچاو:

- زمزیزان: هاوینەهەوار و دێیەکە لە بەینی مەهاباد و سەردەشتدا؛
- زمستان
- زمهەڕ
- زمهەریر
- سۆما برادۆست
- سوومار

+ (بیل؛ بل؛ بەعل Bel: یەزدان، خوداوەندگار؛ خودای گەورەی ئاشوور و بابل کە یەزدانی زەوی و هەموو ئەو ڕووداوانە بوو کە لە سەر زەوی بەدیدەکرا)[1] بەعل لە پێشدا لە لای سومێریەکان نێوی «ئەنلیل» بووە.

---

[1] ل ٦٦ کتێبی «اساطیر آشور و بابل»، ف. ژیران، وەرگێڕانی ئەبولقاسمی ئیسماعیلپوور

بۆ نموونە چەند وشە کە لە پێکهاتەکەیاندا «بیل»ی تێدایە، دەخەینە بەرچاو:

ـ دەشتەبێڵ: دەشت و سارای خودا؛ ناوچەیەکە لە مەرگەوەڕی شاری ورمێ.

ـ کانیبڵ: کانی و چەشمەی خودا؛ کانییەکی خۆش و پڕئاو و سازگار لە نزیک ئاوایی هەجیجی شاری پاوەی ئوستانی کرماشان کە دەڕژێتە ڕووباری سیروانەوە.

ـ ئەردەبیل: هەرد و دەشت و وڵاتی خودا؛ ناوەندی ئوستانی ئەردەبیل

ـ ئەربیل: کە هەر وشەی ئەردەبیلە؛ هەرد و زەوی یەزدان. ناوی دیکەی شاری هەولێرە.

بۆچوونێکی دیکەش بۆ ئەربیل هەیە و ئەویش «ئەربەئیلوو: چوار خودا»یە. کە من ئەوی یەکەمم پێ ڕاستترە.

کەوابوو **واتای وشەی زەمبیل دەبێتە:** هەواری خودا؛ هاوینەهەواری یەزدان[ف] ییلاق خدا

**دووهەم**. وشەیەکی کوردی، فارسییە:

١ـ لە قامووسی «المحیط»دا ئاوا هاتووە: زنبیل: زەرف، سەوەتە، هەمبانە، تۆشەدان[ف] ظرف؛ سبد؛ انبان؛ توشەدان

٢ـ فەرهەنگی عەمید: سەوەتە؛ سەلە؛ سەوەتەیەکی لە قامیش، توولْ یا گەڵای خورما چندرابێ[ف] سبد؛ سلە؛ سبدی کە از نی یا ترکە بافتە شدە باشد.

٣ـ فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە: قرتاڵە؛ زەمبیلە؛ زەمبیل

# زێویە

**Zewye** **زیویە**

ئـاوایییەکە سـەر بە نـاوچەی کولتەپەی جانگیرخـان. ٦٧ مـاڵە و ژمـارەی دانیشـــتووانی ٣٠٤ کەســـە. ئەم ئـــاوایی‌یە مێژوویەکـــی کـــۆنی هەیە و لە نووسراوەکانی سپایی ٢٧٠٠ ساڵ لەوە پێشی ئاشووردا باسی کراوە. قەڵای زێویە ناوەندی دەسـەڵاتی مانناییەکـان بووە و لە ڕووی ئەو شـوێنەوارانەی دیویانەتەوە، دەبێ شـوێن و جێی بنەمـاڵەی شـا بـووبێ. چەند جار لە لایەن سپای ئاشوور و ئورارتۆ داگیر کراوە و بە تاڵان چووە.

زێویە وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(زێو: کانزایەکی سپیڕەنگ و بەقیمەتە فسیم، نقرە) + (یە: لە سـاختمانی وشە یا واژەدا پاشگرێکە کە لەگەڵ «نێو» نێوێکی دیکە یا ئاوەڵناو «صـفت» پێکدێنێ وەک «مەجیدیە»، «نقلیە»، «خیریە» و لەم وشەیەی ئێمەدا کە زێو + یە دەبێتە زێویە.)

**مانـــای تێکـــڕای وشـــەی زێـــویە دەبێـــتە:** ئەو وڵاتەی وەک زێـو وایە و بەقیمەتە؛ وڵاتی زێوین؛ هەروەک وڵاتی زێڕین.

# زوڵفیله

**Zolfile** **زولفیله**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٢٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٨ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. (زوڵف: زڵف، پرچ، کەزی، بسک فا گیسو، زلف، موی عذار) + (یلە: وشەی پاشگر بۆ چکۆلە کردنەوە. وەک: دەرزیلە، کاژیلە فا یله، علامت و نشانه تصغیر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** زولف و ئەگریجەی چکۆلە، بسکی چکۆلەی کە لە سەر ڕوو دەق دراوە فا زولف کوچک

**دووهەم**. (زلف: مێرگ، چیمەن، گیاجاڕ[1] فا چمن، مرغزار) + (یلە: وشەی نیشانەی چکۆلە کردنەوە فا علامت کوچک کردن و تصغیر)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** مێرگ و چیمەنی چکۆلە فا مرغزار کوچک

**سێهەم**. (زلف: حەوزی پڕئاو، جێی کۆبوونەوەی ئاوی باران[2] فا حوض پر آب، جای گردآمدن آب باران) + (یلە: پاشبەندی چکۆلە کردنەوە فا پسوند تصغیر)

---

١و٢ فەرهەنگی فارسی بە فارسی دێهخودا

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** قووڵکەیەکی ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە. مەبەست ئەوەیە ئەو شوێنەی دێیەکەی لێ دروست کراوە، جێیەکی چاڵییە.

**چوارەم**. وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(زەل: قامیش، گیایەکی سێ سووچە لە باتڵاق دەڕوێ، باتڵاق، زەلکاو ف نی، گیاهی است که در باتلاق روید، باتلاق) + (فیلە ـ فیل: حەیوانێکی یەکجار گەورەیە، زەلام، زۆر گەورە ف فیل، جانور بسیار بزرگ، کنایە از شیء بسیار بزرگ)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ئەو زەل و قامیشانەی زۆر گەورەن و لە گەورەییدا بە فیل شوبهێندراون ف نی‌ها بسیار بزرگند و در بزرگی به فیل تشبیه شده‌اند.

پێموایە بە هۆی نزیک بوونی دێی زولفیلە لە چۆمی جەغەتوو، دەبێ کاتی خۆی قامیشی زۆر گەورەی لێ ڕوابێ.

# زاگرۆس

**زاگرس** **Zagros**

ئەم زنجیرە کێوە لە شمالی ڕۆژاوا هەتا باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێران درێژەی هەیە. بە واتایەکی دیکە لە شاری پیرانشاری ئازەربایجانی ڕۆژاوا هەتا پارێزگای چوارمەحالی بەختیاری (یا هەتا شمالی گەرووی هورموز). بە درێژایی پتر لە ۱۰۰۰ کیلۆمێتر و پانایی ۲۰۰ کیلۆمێتر کشاوە. ئەم زنجیرەیە لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی وەک کوردستان، کرماشان، ئیلام و خورڕەمئاباد بە چەند نێو ناسراو و مەشهوور بووە: پاتاق، جەبەلولتاق، پێشکۆ، پشتکۆ و چەند نێوی دیکە.[1]

بە هۆی کارگەری یەکجار زۆری ئەم زنجیرەیە لە سەر ژیانی خەڵکی ناوچەکانی دەور و پشتی، زۆر جار خەڵکی ئاسایی یا مێژووزان و زمانناس و پسپۆڕی بواری تۆپۆنۆمی Toponomy تێکۆشاون وشەی زاگرۆس بناسن و بنج و بناوان و ڕەچەڵەکی دیاری کەن.

ڕەشید یاسەمی و گیرشمەن و دیاکۆنۆف لە نووسراوەکانیاندا باسی وشەی زاگروتی، زیکرتوو، زاکیرتوو دەکەن و دەڵێن ئەم وشەیە هەمان وشەی ساگروتی، ساگارتی یا ساگارتیان و ئاساگارتیایە کە هێرۆدۆت مێژوونووسی یۆنانی باسی کردووە.[2] وەک هۆزێک لە خێڵە مادیەکان نێوی بردووە و واتاکەی «بەردهەڵکەن، بەردبڕ ﻓ سنگکن»ە.

---

۱ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی دێهخودا.

۲ ل ۳۱۲ کتێبی «تاریخ ماد» دیاکۆنۆف، وەرگێڕ کەریم کەشاوەرز

له سەر ئەم ئەساسە هەندێک کەس «بۆ نموونە دوکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد» بڕوایان وایە وشەی زاگرۆس هەر ئەو زاگرۆتی یا زیکرتوو یا ساگارتییە کە یۆنانی‌یەکان لە سەر ئەو زنجیرە کێوەیان داناوە و پێیان گوتووە زاگرۆس. پێشیان وایە وشەی زاگرووتی یا ساگارتی دەبێتە «سەنگ ڕووت ف سنگ لخت و عور».[1]

من پێم‌وایە ئەوەی تا ئێستا لە بابەت وشەی زاگرۆس نووسراوە، بۆچوونێکی سەرسەرەکی و نازانستییانەیە. لەم بابەتەوە قسە زۆرە، بەڵام تەنیا یەک پرسیار دێنینە گۆڕێ: ئەسکەندەری مەقدوونی کە کاتی خۆی[2] (٣٣١ی ب.ز.) ئێرانی داگیر کرد و دەستی دایە سڕینەوەی هەموو شوێنەواری زمان و فەرهەنگ و مێژووی ئەو نەتەوەیە و تەنانەت بۆ شاردنەوەی گەورەیی و شان و شکۆی پادشایانی هەخامەنشی، تەختی جەمشیدی ئاوردا، چۆن نێوی هۆزێکی مادی لە سەر زنجیرە کێوی زاگرۆس دادەنێ؟ تۆ بڵێی چ شانازییەکی بۆ یۆنانییەکان بووبێ؟ لە کاتێکدا دانیشتووانی یۆنانی لە ئێراندا، نێوی یۆنانییان لە سەر چۆم و کەژ و کۆی ئێران دادەنا.[3] بێ‌ئەوەی لەوە زیاتر بچمە ناخی باسەکەوە، بۆچوونی من لە بابەت وەجهی تەسمیەی وشەی زاگرۆس بەم چەشنەیە:

لە میتۆلۆژی یا ئەساتیری یۆنان و ڕۆمدا، ١٢ خودا هەیە (خدایان دوازدەگانە) دوو لەو خودایانە بریتین لە «زئووس یا ژووپیتێر: خودای خوداکان» و دیمێتر «سریس: خودای کەشاوەرزی» کە کوڕ و کچی کرۆنۆس «ساتۆرن: خودای زەمان» و "ڕێئا"ن.

---

١ کتێبی «لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی» دوکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد

٢ ل ٤٠٧ کتێبی «تاریخ ماد» دیاکۆنۆف.

٣ ل ١٠٢ کتێبی «تاریخ ایران کمبریج» جلد ٣، قسمت ١، وەرگێڕاوی دکتۆر تەیموور قادری

لە پەیوەند و ژن و مێردایەتی زئووس و دیمێتر، کە خوشک و برا بوون، کچێک لە دایک بوو بە نێوی "پێرسێ‌فۆن: پرسفن". ئەم کچە لە لایەن مامی خۆی بە زۆرداری ڕفێنرا و هەڵگیرا و لە ئاکامدا بوو بە ژنی ئەو کە نێوی "هادێس یا پلۆتۆن" بوو کە خودای دونیای مردووان یا خودای جیهانی ئەرواح بوو.[1]

زئووس «خودای خودایان» عاشقی "پێرسێ‌فۆن" دەبێ کە کچی خۆی بوو و هەڵی‌دەفریوێنێ. ئاکامی ئەم عیشق و لە یەک نزیک بوونە، کوڕێک بوو بە نێوی "دیونیزۆس". لەقەب یا نازنێوی ئەم پیاوە "زاگرۆس zagros" بوو[2] کە واتاکەی «ڕاوچی گەورە» یا «ڕاوکەری گەورە» یا «نێچیروانی مەزن» بوو.

ف شکارچی بزرگ، نخجیربان بزرگ، صیاد بزرگ.

پێم وایە هۆی ئەم نێونانە ئەوە بووە کە سەر تا خواری ئەم زنجیرە کێوە پڕ بووە لە حەیوان و ئاژەڵی کێوی، وەک ئاسک، بزنەکێوی، بەراز، ورچ، گورگ، کەروێشک، ڕێوی و هەموو باڵندەکان. ئەم بارودۆخە بۆ ڕاو و شکار زۆر لەبار بووە.

---

١ ل ٩ کتێبی «مبانی فلسفی اساطیر یونان و روم» دکتۆر سەعید فاتمی

٢ ل ١١٧، سەرچاوەی پێشوو.

# سان‌سالاران؛ حه‌سه‌ن‌سالاران

**حَسَن‌سالاران** **Hesen salaran**

ئـاوایییه‌که سـه‌ر به نـاوچه‌ی زولفه‌قـاری سه‌رشـیوی سـه‌قز. ٣٥ مـاڵه و ژماره‌ی دانیشتووانی ١٨٢ که‌سه.

نێـوی ڕاسـته‌قینه‌ی ئه‌م دێـیه له سـه‌ر زمـانی خه‌ڵکـی و له گفتگـۆدا «سان‌سالاران»ه.

ئه‌م وشه‌یه کوردییه له دوو به‌ش پێکهاتووه:

بۆچوونی **یه‌که‌م.** (سان: نازنێو یا له‌قه‌بێکه که له نێو کورده‌کانی گۆراندا ماوه و بۆ سه‌رگه‌وره‌کانیان به‌کاری دێنن، وه‌ک "جافرسان".[1] "سان" به مانای پیـرۆزه. ئه‌م وشـه‌یه له زمـانی لاتینـدا وه‌ک saint هه‌یه. دوور نییه وشـه‌ی سیمورغ له بنه‌ڕه‌تدا سان‌مر واته مه‌لی پیرۆز بووبێ.

لێره‌دا سان‌سالاران به مانای سه‌رداران و ئه‌میرانی پیرۆز و موباره‌که.

بۆچـوونی **دووهه‌م.** (سـان به مانـای فه‌رمـانڕه‌وا و سـوڵتان و حـاکم و نازنێوی میرانی هه‌ورامانه[2] و ئه‌و مانایه به ڕوونی له‌و ڕسته‌یه‌ی خواره‌وه‌دا ده‌بینـدرێ: حه‌مه‌سه‌عیدسـان له‌گه‌ڵ عه‌بـدوڕه‌حمان‌به‌گی کوڕیـا له قه‌ڵای جوانڕۆ به ده‌ستی شه‌ڕه‌فولمولک کوژراون. پاش ئه‌و ڕۆسته‌م بووه به سانی

---

١ ل ٢٨٦ کتێبی وشه‌نامه، جه‌مال نه‌به‌ز

٢ هه‌نبانه‌بۆرینه ـ هه‌ژار

هەورامان.[1] ف سلطان؛ حاکم و لقب امیران اورامان) + (سالاران: گەورەکان؛ سەرۆکەکان؛ ئەمیران؛ گەورەکانی کۆمەڵ ف سرداران؛ بزرگان؛ مهتران قوم)

کەوابوو سەرجەمی مانای وشەی سانسالاران دەبێتە: گەورەی گەورەکان؛ سەرۆکی سەرداران؛ سوڵتانی ئەمیران ف سردار سرداران؛ سلطان امیران؛ شاه شاهان

بۆچوونی سێهەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(حەسەن: نێوی پیاوانە نامی برای مردان) + (سالار: گەورە، سەرۆک، ئەمیر سردار، بزرگ، امیر) + (ان: ئەلف و نوونی باب و فەرزەندی، ئەلف و نوونی ئەبوەت، ابوت نشانە پدر و فرزند)

کە وا بوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە: حەسەنی کوڕی سالار حسن پسر سالار

**بۆچوونی چوارەم.** وشەکە کوردییە و سێ بەشە:

(حەسەن: نێوە بۆ پیاوان نامی برای مردان) + (سالار: نێوە بۆ پیاوان، سەرۆک، سەردار ف نامی برای مردان، سردار، امیر) + (ان: نیشانەی شوێن و جێیە ف علامت مکان، محل)

واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە: شوێن و مەکانی سالار حەسەن ف محل و مکان سالار حسن

---

[1] ل ٢١ کتێبی «دیوانی پیرشالیاری زەردەشتی هەورامی»، محەمەد بەهائەدین مەلاساحێب

# سەڵتەکەڵتوو

سَرتَکَلتو **Sertekeltû**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی ســەقز. ٥٦ مــاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣١٧ کەسە.

ئەم وشەیە نیوەکوردی و نیوەتورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سـەڵ؛ سـەر: بەرزتـرین خـاڵی شـوێنێک؛ سـەرووی شـتێک[ف] سـر؛ رأس؛ بالاترین نقطه در هر چیز) + (تەکەڵتوو: لبادی نەرم؛ نمەد؛ لوا؛ کۆڵاو؛ نمەو[ف] نمد)[1]

مانای وشەکە دەبێتە: بەرزترین شوێنی ئەو جێیە، نەرمە وەک لباد (نمد).

ئەو دێـیە لە شـوێنێک دروسـت کـراوە کە تەختـایی و پـان و بەریـن و نەرمانییە و وەک لبادی ژێر زینی ئەسپ نەرمە[ف] رأس آن نرم و صاف است مانند نمد زیر زین اسب.

لە سەردەمی حوکم و دەسەڵاتی سەفەویە (صفویە) لە نێو دەوڵەتدا کار و پیشەیەک بووە بە نێوی «صاحب جمع شترخان» یانی کەسێکی وشترخان لە ژێر دەسـت و چـاوەدێری ئەودا بەڕێـوە چـووە. لە باسـی «صـاحب جمـع شــترخان» و ئەو کەلــوپەلەی پێــی دەســپێردرا وەک «جـل، جەواڵ، لبــاد، تەکەڵتـوو، پەت و گـوریس و ئەو شـتانەی دیـکەی پێوەنـدی بە وشـترخانەوە هەبوو، نێوی وشەیەک دەبیندرێ کە پێی دەڵێن تەکەڵتوو (تکلتو) و ماناکەشی ئاوایە:

---

١ ل ٣٦ کتێبی «تذکره الملوک» نووسینی میرزا سەمیعا بە حەولی سەید محەمەد دەبیرسیاقی و فەرهەنگی عەمید و فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

تەکەڵتـوو لبـادێکە لە بـن زینـی سـەرپشـتی ئەسـپ دادەنـدرێ بـۆ ئەوەی پشتی ئەسپەکە بریندار نەبێ یا نەئێشێ. جا چونکە مووچە و مەزرا و شوێنی ئەو دێیە تەخت و نەرمان و دەشـتایی بووە بە تەکەڵتوویان شـوبهاندووە و کوتوویـانە سـەرتەکەڵتوو یـانی سـەری ئەو شـوێنە تەخت و نەرم و دەشـتان بووە و لە تەکەڵتوو چووە.

# سلێمانکەندی

**سُلَیمان کندی** **Slêmankendî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٧٩ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٧٠ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە ولە سێ بەش پێکهاتووە:

(سلێمان؛ سولێمان: نێوی پیاوانەفنامی است برای مردان) + (کەند: دێ؛ گوند؛ ئاواییفدە؛ آبادی) + (ی: یای نیشانەی پێوەندی و نیسبەتەفیاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دێی سلێمان؛ ئاوایی سلێمانفدە سلیمان؛ آبادی سلیمان

وا دیارە لە سەردەمی هێرشی تورکان بۆ سەر ناوچەی فەیزوڵڵابەگی، ئاغا و مالکی ئەم دێیە نێوی سلێمان بووە.

– هەروەک دەبینین واتای دوو ئاوایی «سلێمانکەندی» و «دایەسلێمان» هەریەکن و دەبێتە: دێی سلێمانفدە سلیمان.

# سرنجداغ

**سرنجداغ** **Sirncdağ**

دێـیەکە ســەر بە نــاوچەی خوڕخــوڕەی ســەقز. ٢١ مــاڵە و ژمــارەی دانیشتووانی ١٤٩ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سرنج؛ سارنج؛ سەرن: سارد؛ فێنک ف سرد؛ خنک) + (داغ: کێو؛ کێف ف کوه)

مانای وشەکە دەبێتە: کێوی سارد؛ کوێستانی سارد ف کوهستان سرد

دێیەک هەر بەم مانایە بەڵام بە زمانی کوردی بە نێوی "ساردەکوێستان" لە شاری بۆکان هەیە.

# سماقلۆوو

سُماقلو                                    Simaqlû

دێـیەکە ســەر بە نــاوچەی زولفەقــاری سەرشــیوی ســەقز. ٧٣ مــاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٩٣ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سماق: میوەیەکی زۆر وردی ترشە؛ ترشی سماق[ف]سماق) + (ڵوو؛ لوو: شوێن؛ جێ؛ خاوەن[ف]مکان؛ دارای)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێیەکی داری ترش و سماقی لێیە [ف]محلی کە درخت و بوتەی سماق دارد.

* سماقان: دێیەکی چۆڵکراوی نزیک ئۆرتەکەندی بۆکانە.

# سونج

**سونج** **Siwinc**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٣٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦١ کەسە.

بۆ ماناکردنەوەی ئەم وشەیە ئەو بۆچوونانەی خوارەوە هەیە:

**یەکەم.** وشەکە تورکییە: (سونج: نیشان؛ عەلامەت؛ دیاردە[ف] نشان؛ علامت)[1]

**دووهەم.** لە نێو مەغوولەکاندا نێوە بۆ پیاوان و دێ و ئاوایی:

ـ لە باشووری دەرەوەی شاری نەخشەب مابەینی نەخشەب و کەش، دێیەک بووە بە نێوی سونج.

ـ ئۆلجایتۆ کوڕەکەی خۆی لە ژێر چاوەدێری ئەمیری سونج، کرد بە حاکمی خۆراسان.[2]

ـ بایانکۆ، سونجخان و کسلیخان کاتی شەو لە گەڵ خزمان لە قەڵا هاتنە دەرێ.

**سێهەم.** وشەکە تورکییە: سوینج: شادی؛ خۆشحاڵی[ف] شادمانی؛ سرور؛ خوشحالی[3]

---

١ ل ٦٧٠ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ کتێبی «روزگاران» نووسینی عەبدولحوسەینی زەڕینکوب، ل ٥٣٢، ٥٣٣

٣ کتێبی «جامع التواریخ» نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

# سپەوڕە

**سپەدڕە** **Sipewre**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ١١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٨ کەسە.

ئەم وشەیە لەو زمانانەدا دەبیندرێ: ئاوێستایی، مادی و کوردی. لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سپە: سەگ[ف]سگ) + (وڕە: وڕە؛ وەڕین[ف]پارس کردن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** سەگوەڕ؛ وەڕینی سەگ[ف]پارس کردن سگ

لە لاپەڕە ٦٥ی کتێبی «مێژووی ماد» نووسراوی ا.م. دیاکۆنۆف ئاوا باسی ئەم وشەیە کراوە:

- لە زمانی ئاوێستاییدا: سپان؛ ئەسپەکە؛ سپەگە: سەگ[ف]سگ
- لە زمانی مادیدا: سپاکا؛ سپەکە؛ دێڵەسەگ[ف]سگ مادە
- لە زمانی سمنانیدا: ئەسپە: سەگ[ف]سگ
- لە زمانی تالشیدا: سپە: سەگ[ف]سگ

لە زمانی کوردیدا: لە زۆر شوێن بە سەگ دەڵێن سپڵۆت

# سرمووسێ

سُرخ‌موسی　　　　Sirmûsê

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی خورخـورەی سـەقز. ٣٧ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١٩٢ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ماناکەی دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سر: سوور[ف]سرخ) + (مووسێ: مووسا؛ ناوە بۆ پیاوان[ف]موسی؛ نامی برای مردان)

مانای وشەکە دەبێتە: مووسا سوور[ف]سرخ موسی، موسی سرخە.

**دووهەم.** ئەم وشەیە لە نێوێکی ناسراوی مێژوویی (مووساسیر) دەچێ کە نێوێکی ئورارتوویی‌یە.

مووساسیر Musasier نێوی شارێکی پیرۆزی «هالدی؛ خالدی»یە کە یەزدانی شایەکانی ئورارتۆ و نیگابان و پارێزەری مەڵبەندی دەسەڵاتی ئەوان بووە و «ئاردینی»شیان پێ کوتووە.[1]

ئەم نێوە وەک چەند شوێنەواری دیکە (کێلەشینی شنۆ، دووگردی شاری سەردەشت و نووسـراوە بەردینەیەکـی کێـوی تەرەغەی بۆکـان و لەوحە بەردنووسـەکەی قەڵایچـی دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەردەمی دەسـەڵاتی دوو شـای ئورارتـۆ (ئیشـپۆئینی و مێنـوا) لە سـاڵەکانی ٨٢٥-٧٨٣ ب.ز.[2] دەتـوانین بڵێـین

١ ل ٢٤ و ٢٥ کتێبی «لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی»، دوکتۆر جەمال ڕەشید ئەحمەد

٢ ل ٦٩ کتێبی «تمدن اورارتو»، نووسینی بوریس پیۆترۆفسکی

لەو ساڵانەی ئورارتۆییەکان بە سەر ناوچەی ماننادا زاڵ بوون، ئەو دێیەیان نێوناوە سرمووسێ کە بەرئاوەژووی وشەی مووساسیرە.

**سێهەم.** دەکرێ بڵێین «سرمووسێ» لە دوو بەشی (سەر؛ کەللە؛ بەرزایی هەر لەشێک [ف] رأس؛ کلە؛ نوک) + (مووسێ: ناوی ئاوایی [ف] نام روستا) پێکهاتووە.

ماناى گشتی وشەکە دەبێتە: سەری مووسێ [ف] رأس و بالای موسی

هەروەک: سەرچاوە؛ سەرسێف؛ سەرکەل؛ سەردەرە.

**چوارەم.** دەکرێ بڵێین مەبەست لە «سرمووسێ»، مووسێی سەروو یا مووسێی عولیا یا مووسێی ژوورووە لە بەرانبەری مووسێی خواروو یا مووسێی سۆفلا یا مووسێی پاییندا.

* لە بۆکانیش دێیەک هەیە بە نێوی مووسێ لە بەشی گەورک.

# سووته

سوته Sûte

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی چـلچەمەی سەرشـیوی سـەقز. ١٩ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٢٢ کەسە.

وشـەکە فارسـی و کوردییـە و مانـاکەی دەبێـتە: سـووتە: سـووتاو؛ سووزیاگ[ف]سوختە

هەرکات پیتی «خ» لە بەرانبەر پیتێکی بزوێن (صدادار)دا هەڵکەوێ، بە تەواوی لادەبردرێ و ناخوێندرێتەوە. وەک وشـەی «سـوختە»ی فارسـی کە «خ»یەکەی لادەچێ و دەبێ بە «سوتە».[1]

دەکرێ بڵێین هـۆی نێونـانی ئەو ئـاوایییە ئەوە بـووە کە لە ڕۆژگارێکدا سووتاوە و نێوی دێ سووتاویان لە سەر داناوە.

* لە دێی سیادەری سەروو، کێوێکی لێیە بە نێوی «کوڕە سووتە».



وێنەی ٩ـ دێی سووتە

١ ل ٢٨٦ کتێبی «یک سال در میان ایرانیان»، نووسینی ئێدوارد براون

# سۆڵە

**سوله** **Sole**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی خوڕخـوڕەی سـەقز. ١٩ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١٠٨ کەسە.

**یەکەم**. سۆڵە وشەیەکی کوردییە و واتاکەی: (بەستەڵەک؛ سەرمای توند ف یخبندان؛ سرمای سخت).

ئەو دێیە لە ناوچەیەکی کوێستانی و سارد نزیکی زنجیرە شاخەکانی چلچەمە هەڵکەوتووە. بە بۆنەی سارد و کوێستانی بوونیەوە ئەو نێوەیان لێناوە.

ئەم وشەیە ئێستاش لە قسە کردن و ئاخاوتندا کەڵکی لێوەردەگیرێ. وەک: بەفرێکی زۆر باریوە و سەرما و سۆڵەیەکی سەیرە.

* دێیەک بەو نێوە لە نزیک شاری «گەرماب»ی ئوستانی زەنجان هەیە.

دووەم. وشەیەکی کوردییە و واتاکەی: پڕخوێ، سوێر کە لە بەشێک لە ناوچەکانی کوردستان پێی دەڵێن «سۆڵ» ف پرنمک، شور

لەوە دەچێ بە هۆی سوێر بوونی خاکی دێیەکە نێویان نابێ سۆڵە. بەڵام من بۆچوونی یەکەمم پێ ڕاستە.

# ساحێب

**صاحِب** **Sahêb**

ئەو دێیە ناوەندی ناوچەی ساحێبە و بووە بە شار. ٥٦١ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢١٣٨ کەسە.

ئەم وشەیە عەرەبیە:

ساحێب؛ صاحب: خاوەن ف مالک؛ خداوند چیزی

لە زمانی فارسیدا لەگەڵ وشەگەلی دیکە تێکەڵاو بووە و زۆر وشەی تازەی پێکهێناوە: صاحب اختیار؛ صاحب امتیاز؛ صاحب جمع؛ صاحبخانە؛ صاحب سخن؛ صاحبقران (نیکبخت؛ خوش اقبال) و هیتر.

سەردەمی دەستەڵاتی مەغوولەکان، ڕاوەستانێکی کاتی لە درێژەی دەوڵەتداری بەدیهێنا. وەزیر کە بە «ساحێب؛ صاحب»یش ناسرابوو، وەزیری سەرەکی و چاوەدێری هەموو کاروباری دەوڵەت و کاری دیوانی نەبوو. بەڵکوو ئەرکی سەرشانی لە پاڵ ئەرکەکانی کاربەدەستانی مەغوول، پێڕاگەیشتن بە کاروباری باج وماڵیات بووە[١]. کەوابوو دەتوانین بڵێین **مانای ئەم وشەیە:**

١ـ خاوەن؛ مالک ٢ـ وەزیر.

---

١ ل ٥٩ کتێبی «تداوم و تحول در تاریخ میانه ایران» نووسینی ئان لمباتن

# سوننەتە

سُنَّتِه Sonete

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ١٩٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٨٦٠ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی مانای ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە عەرەبیە (سُنَّة و کۆیەکەشی دەبێتە سُنَن):

سوننەت: ١ـ ئاکار؛ ڕێگا و ڕەوش ٢ـ شەریعەت؛ ڕێوشوێنی ئایینی و دینی ٣ـ وتە، ئاکار و کردار و نووسینی پێغەمبەری ئیسلام «د.خ»؛ ئەو ڕێبازەی پێغەمبەر و یاران و سەحابەکانی عەمەلیان پێ کردووە.[1] سوننەت کردن: خەتەنە کردن، کە هەر بە مانای بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی پێشینانە.

**دووهەم.** وشەیەکی تورکییە (سوننەتە):

(ئەسنتە: جێیەکی زۆر بای بێ؛ شوێنێک باگر بێ؛ بزووتنەوەی دایمی هەوا؛ شوێنێک بای لێوە بێ؛ سوننەتە شوێنێکە زۆربەی کات بای لێوە دێ؛ باگرە|ف| جایی کە باد غالبا وزان است؛ مکانی بادخیز؛ بسیار وزندە.[2]

من پێموایە مانای دووهەم (تورکی بوونی وشەی سوننەتە)، بە هۆی ئەوەی ئاواییەکانی دەوروبەری وەک: چاپانی سەروو و خواروو؛ ئینچکە و قەرەول تورکین، ئەم وشەیەش دەبێ تورکی بێ. بەڵام بە هۆی عومری چەنسەت ساڵەی ئەم وشەیە لەسەر زاری خەڵک ساوە و هێندێک گۆڕدراوە. ئەسنتە ← سُنتَه ← سوننەتە

---

١ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی عەمید

٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# سوولاکان

**سولاکان** **Sûlakan**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٢٣ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٩٧ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. لە ماوەرائوننەهر وڵاتێکی لێیە بە نێوی «سـولیک» کە نەتەوەی ئێرانی «سوغود؛ سُغُد» لەوێ دەژین. جەمع یا کۆی ئەو نێوە دەبێتە سـولیکان یـا سـولاکان (سـولیک + ان: سـولیکان).[1] وا دیـارە لە کـاتی هێرشـی تـورک و مەغوول نێوی ئەو وڵاتەیان لەسـەر ئەم دێیە داناوە و لەو چەشـنە نموونـانە زۆرن. وەک: تبتی چین و تبتی بۆکـان؛ چیچیخواری مەغولسـتانی نـاوخۆیی چین و دێی چیچیخواری سەقز. هەروەها زۆر نێوی تر.

**دووهەم**. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سـوولاک: سـوولاوک؛ پلووسـک؛ ئاوهەڵـدێر[2] ف نـاودان؛ آبشـار) + (ان: نیشانەی کۆ؛ پاشگری کۆ؛ پەسوەندی جەمع ف علامت و نشانەی جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** پلووسکەکان؛ ئاوهەڵدێرەکان؛ سۆلاڤەکان ف ناودان‌ها؛ آبشارها

---

١ ل ١٤١ کتێبـی «نخسـتین انسـان و نخسـتین شـهریار» وەرگێڕانـی ژاڵەی ئامووزگـار، ئەحـمەد تەفەزولی

٢ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

له لاپەڕە ١٧٠ی کتێبی «ایران و ترکان در روزگار ساسانیان» نووسینی عینایەتوڵڵا ڕەزا ئاماژە بەو وشەیە کراوە:

«وڵاتی خەزەر لە لایەکەوە جیرانی لێوارەی ڕۆژئاوایی دەریای خەزەر هەتا چۆمی «سوولاک sulak»ە.

لە «عیلمئاباد»ی «ئەراک»یش کانیەکی لێیە بە ناوی «چشمەی سولاخان»[1]: کانی پلووسک؛ کانی ئاوهەڵدێر.

* هەندێ کەس پێیانوایە وشەی سوولاکان لە نێوی «سلووکیان»ی جێنشینانی ئەسکەندەری مەقدوونی وەرگیراوە. بەڵام ئەم بۆچوونە هەڵەیەکی ئاشکرایە.

* سوولاخان کێوێکە لە دەوروبەری تاران نزیک دێهکەدەی ئولەمپیک.

---

١ کتێبی «اساطیر ایران»، جان راسێل هینلز، ل ٤٣٣

# سراجگا

**سراجگاه** **Seracga**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ئێستا چۆڵکراوە و کەسی لێ ناژی.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم**. ئەم وشەیە کوردییە:

(سیراج: خواردنێکە لە دۆی کوڵاو دەسدەکەوێ؛ شیرێژ ف کتخ؛ شیراز) + (گا: گاە؛ شوێن؛ جێ ف جا؛ مکان؛ محل)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی شیرێژی لێیە؛ جێیەکی سیراجی لێ دروست دەکرێ ف محل و مکان شیراز

**دووهەم**. ئەم وشەیە عەرەبیە:

(سەراج: کەسێکی زین دروست دەکا؛ زینساز؛ زینفرۆش ف زینساز؛ زینفروش)[2] + (گا: گاە؛ شوێن؛ جێ ف جا؛ مکان)

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ فەرهەنگی فارسی عەمید

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی زینسازی لێیە؛ شوێنێکی زینی ئەسپی لێ دروست دەکرێ ف محلی کە زینساز دارد؛ مکان و محل زینسازی

**سێهەم.** وشەکە عەرەبیە:

(سەراج: چرا؛ نێوی پیاوانیشە وەک شێخ "سراجالدین" ف چراغ)[١] + (گا: گاه؛ شوێن؛ جێ ف جا؛ مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی سراجی لێیە؛ شوێنێکی چراغی لێیە؛ شوێنێکی چرا و ڕۆشنایی و شێخی لێیە ف محل و مکان سکونت سراج؛ مکان و جایگاه چراغ؛ مکان و محل نور و روشنایی و شیخ.

مەزرایەکیش بە نێوی «سراج آباد؛ سراجئاباد» لە ئاوایی پارسانیان هەیە.

بۆچوونی سێهەم مانای بابەتەکەیە و ڕاستترە.

---

١ سەرچاوەی پێشوو

# سەرکەل

**سَرکَل** **Serkel**

ئەو دێیە لە ناوچەی سەرا لە مابەینی سەقز و بۆکان هەڵکەوتووە. ١٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٨ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سەر: هەرشتێ لە باڵا و لای ژوورەوە هەڵکەوتبێ؛ لە ئەستۆ و مل بەرەو ژووری گیاندار ف رأس؛ کلە؛ سر) + (کەل: چیا؛ کەژ؛ کۆ؛ بستوو؛ زینوو ف کوە؛ گردنە)

کەوابوو **مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** سەرکێو؛ ملەی کێو؛ سەر چیا ف بالای کوە؛ رأس و بالای گردنە

زۆر شوێن و ناوچە بە وشەی «سەر» دروست کراون. وەک:

ـ سەرسێف: (سەر: باڵا؛ ژوور ف رأس؛ کلە؛ سر) + (سێف: سێو؛ میوەی بەنێوبانگ ف سیب). مەبەست ئەوەیە سەری ئەو شوێنە داری سێوی لێ بووە.

ـ سەرچاوە: (سەر: باڵا؛ ژوور ف رأس؛ کلە؛ سر) + (چاوە: کانی؛ هانی ف چشمە) ماناکەی: چاوەکانی؛ سەرچەشمە ف سرچشمە

ئەم دێیە بە هۆی ئەوەی چاوەکانیەکی زۆر گەورەی هەیە کە لە کاتی پڕئاویدا وەک چۆمێک وایە و لە ژوور دێ هەڵکەوتووە، نێوی سەرچاوەیان لێناوە. ئەم ئاواییە سەر بە ناوچەی سەرایە و لە مابەینی سەقز و بۆکان هەڵکەوتووە. ١٠٢ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥١٩ کەسە.

ـ سەردەرە: ئاواییەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیو.

ئەم نێـوە کوردییـە و بـریتیە لە (سـەر: بـاڵا؛ ژوور[ف]رأس؛ کـلە؛ سـر) + (دەرە: شـیو؛ دۆڵ[ف]درە). مانـاکەی: ئەو دێـیە لە جێـیەک هەڵکەوتـووە دۆڵ و شیو و دەرەیە.

ـ سەرتەکەڵتوو: ئاواییەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیو.

ئەم وشەیە تێکەڵاوێکە لە دوو وشەی کوردی و تورکی:

(سـەر: بـاڵا؛ ژوور[ف]رأس؛ کـلە؛ سـر) + (تەکەڵتـوو: لبـادی نەرم؛ نـمەدی نەرم[ف]نمد زیر زین اسب)

مەبەسـت ئەوەیە ئەو ئـاواییە لە شـوێنێک دروسـت کـراوە تەخـت و نەرمانە وەک لبادی ژێر زینی ئەسپ[ف]محل استقرار آبادی جایی است صاف و تخت و هموار همچون نمد.

ـ سەرشیو: مەڵبەندێکە لە نێوان دوو شـاری سـەقز و مەریـوان کە بـریتیە لە سەرشیوی سەقز و سەرشیوی مەریوان. ئەم ناوچەیە زۆر سەرسـەوزە و بـوورە و مەرتەعـی یەکجـار چـاک و پـلە یەکەمـی هەیە. ٥٧ دێـی ئـاوەدان و چـۆڵکراو لە سەرشـیوی سـەقز هەڵکەوتـوون. بە هـۆی ئەو شـیو و دۆڵ و دەرە درێــژەی کە لە ســەرەتای سەرشــیو هەتــا کۆتــایی ئەو نــاوچەیەی داگرتـووە و یەکـێ لە شـاخەکانی چـۆمی جەغەتـوو (چـۆمی ئایەنـان) پێـدا تێدەپەڕێ، بەم نێوەوە ناسراوە.

هەروەهـا زۆر جـێ و ئـاوایی دیـکەش بەم چەشـنە داڕێـژراون: (سـەر + وەشـەیەک) وەک: سەرچنار: سەیرانگای بەنێوبانگی سلێمانی، دێی سەرچناری میاندواو (کەڵبەڕەزاخان).

ـ دێی سەربەرد، بانە

ـ دێی سەربەرزە، کامیاران

ـ دێی سەربناو، کامیاران

ـ دێی سەرتەزێن، سەردەشت

و ....

# سیانزار

**سیانزار** **Syanizar**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٢٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٦٢ کەسە.

وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(سیا: دژی سپی؛ ڕەش ف سیاه) + (نزار: لێڕەوار؛ شاخ و کێو ف جنگل؛ کوه)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** لێڕەوار و شاخ و کێوی ڕەش؛ کێوەڕەش ف سیاەکوه

# سێ کوچکە

**سه کوچکه** **Sêkuçke**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیو. چۆڵ کراوە و کەسی تێدا ناژی.

ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(سێ: ژمارەیەکە بۆ بژاردن، ژمارەی پاش ١ و ٢ ف عددی است بعد از ١ و ٢) + (کوچک: بەرد، سەنگ، کێو ف سنگ، کوه) + (ە: پیتێکە بۆ ناساندنی وشەی پێش خۆی ف حرف تعریف و شناسایی)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** سێ بەردە، سێ سەنگ، سێ کێو، سێ بەردی کوانوو ف سه سنگه، اصطلاحا سه کوهه؛ سه سنگ اجاق

مەبەست لە سێ سەنگ یا سێ کێو، ئەو سێ کێوەیە کە دەوری ئاواییەکەیان گرتووە:

١. شاخی کەڵەکەجاڕ کە ٢٧٩٨ مێتر بەرزە.

٢. شاخی کۆتەڕەش کە ٢٥٩٢ مێتر بەرزە.

٣. شاخی گڵەقەڵا کە ٢٢١٨ مێتر بەرزە.

چەند دێ کە وشەی کوچک بە نێوەکەیانەوەیە:

- "کوچک"ی سەروو «کوچک علیا» لە ناوچەی سەرا.
- "کوچک"ی خواروو «کوچک سفلی» لە ناوچەی سەرا.
- کووچەتەڵا «کوچه طلا» لە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان.
- کوچک و وەتەمیش «کوچک اوتمیش» لە بۆکان.

# شێخەڵتاریک

**Şêxeltarîk** **شَیخَ‌التارک**

زنجیرە کێوێکە لە نێوان دێیەکانی ڕۆستەمان، دەرەوەزانی خواروو، شێخەڵە، دەرەسمایلە و کەندۆڵان. بەرزایی ئەم کێوە ٢٣٠٣ میترە.[١]

ئەم وشەیە عەرەبیە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(شێخ: پیری تەریقەت؛ سەید؛ مورشید؛ پیر ف پیر طریقت؛ سید؛ مرشد؛ بزرگ) + (ئەڵ؛ ال: وشەیەکە بۆ ناساندن؛ وشەی تاریف ف حرف تعریف عربی) + (تاریک؛ تارک: کەسێکی هەموو شتێکی وەلانابێ؛ کەسێکی دنیا و شتی دنیایی فڕێدابێ ف تارک دنیا؛ کسی کە تعلقات مادی و دنیایی را بە کنار نهادە باشد؛ ترک کنندە)

کەوابوو مانای تێکڕای وشەی «شێخەڵتاریک» دەبێتە:

ئەو شێخ و پیر و مورشیدەی دونیای وەلانابێ ف شیخ و مرشد تارک دنیا.

وا دیارە لە شوێن و جێگایەکی ئەو زنجیرە کێوە وەک ئەشکەوت و شتیوا شێخێک بۆ دووری لە خەڵک و پاڕانەوە و لاڵانەوە لە یەزدان ژیاوە و شەو و ڕۆژی خۆی لەوێ تێپەڕ کردووە و هەر بەو بۆنەیەوە نێوی ئەویان بە سەر ئەم کێو و شاخەدا بڕیوە.

---

١ ل ٣٦٩ کتێبی «جوغرافیای تاریخی کوردستان» نووسینی جەلال شافیعی

# شیپانەجۆ

**شیپانجو** **şîpaneco**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٣٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٨٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(شی؛ سواوی وشەی شیو: شیو؛ دۆڵ؛ دەرە[ف]دره) + (پان: گەورە؛ بەرین[ف]پهن؛ عریض) + (ە: ئەم پیتە مەعریفە یا ناسێنەرە[ف]حرف معرفه) + (جۆ: جۆگە؛ جۆگەلە[ف]جوی؛ نهر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شیو و دۆڵەی جۆگە پانەکەی پێدا دەڕوا؛ شیوی پانەجۆگە[ف]درەای کە جوی و نهر پهن و عریض از آن می‌گذرد.

# شیوەتوو

**شیوتو** **şîwetû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٣٠ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٧٨ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(شیو: دۆڵ؛ دەرە ف درە) + (توو: تووی شیرین؛ داری توو؛ تفێ ف توت؛ درخت توت شیرین)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شیو و دۆڵێکی داری تووی شیرنی تێدا بێ ف درەای دارای درختان توت شیرین.

**دووەم.** وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(شیو: دۆڵ، دەرە ف درە) + (توو: شوێن، جێ، وڵات ف محل، مکان، سرزمین)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** جێ و شوێن و وڵاتێکی لە شیو و دۆڵدا دروست کراوە.

# شقۆیف

شقویف şiqoif

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٢٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٩ کەسە.

ئەم وشەیە عەرەبیە:

اَلشـقیف (شـقۆیف): گاشـەبەردێکی لە کێو کەوتبێتە خوارەوە؛ صخرەی بزرگ فروغلتیده از کوه[1]

لە سووریە لە کەناری دەریا و لە سی کیلۆمێتری شاری سەور (صَور: ئەم وشەیەش بە مانای گاشەبەرد و تەلەسەنگە) قەڵایەکی زۆر ڕژد و سەخت و ڕەوەزێکی ماه و حەستەم بوو بە ناوی (شقیف). ئەورووپاییەکان بەو قەڵایەیان دەگوت «بۆفۆر».[2] سولتان سەلاحەدینی ئەیووبی لە ساڵی ١١٩٣ی زایینی بۆ ئەوەی داگیری کا، گەمارۆیدا. بەڵام بە هۆی ئەوەی هەواڵیان بۆ هێنا خاچپەرستەکان دەوری بەندەرگەی عەکایان داوە، دەستی لە گەمارۆی ئەو قەڵایە هەڵگرت.

بە بڕوای من، تورکانی سەلجووقی (١١٩٤؛ ١٠٤٠ زایینی) کە دەسەڵاتی شام و وڵاتانی دەوروبەری و ئێرانیان بە دەستەوە بووە، لە کاتی داگیرکردنی ئەو دێیە نێوی قەڵای «شقیف»ی سووریەیان لەسەر داناوە.[3]

١ ل ١٢٧٩ فەرهەنگی عەرەبی ـ فارسی لارووس بەرگی دووهەم

٢ ل ١٠٤ پەراوێزی کتێبی «شەرەفنامە»ی کوردی، وەرگێڕدراوی هەژار

٣ ل ٣٤٤ کتێبی «تاریخ تمدن»، بەرگی یەکەم، نووسراوی ویل دۆرانت

# شاشایل

**şaşayel** **شاشاگُل ـ نورآباد**

ئەم دێـیە سـەر بە نـاوچەی ئیمـامی سـەقزە. ٣٢ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ١٤٣ کەسە.

**یەکەم.** وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(شـا: میـر، زۆر گەورە، سـەرۆک، زلتـر، شـیاوتر ف پادشـاه، امیـر، بسـیار بـزرگ، شایسـتەتر) وەک نادرشـا، شـاعەبباس، شاسـوار، شـارەگ، شـاباڵ، شاباز.

لە نێو سەید و شـێخەکاندا، کەڵک وەرگرتن لە وشـەی «شـا» بۆ نێو یـا «لەقەب ـ نازنێو» باو بووە.

+ (شاگوڵ: گوڵی زۆر جوان، گوڵی زۆر نایاب، گوڵی زلـی وێنە مـافوورە «فەرش و قـالی»، گوڵی سـەرەکی دەخڵودان ـ نێوی پیـاوانە ف گل بسـیار زیبا، گل نایاب، نقش بزرگ قالی، خوشـەی برتـر غلە، نـامی بـرای مـردان در میان سادات)

**کەوابـوو واتـای وشـەکە دەبێتە:** شاگوڵشـا، شـاگوڵی سـەرۆک و زۆر گەورە ف شاه شاگل، امیر شاگل

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(شا: میر، گەورە، سەرۆک، شیاوتر، پادشا ف پادشاه، امیر، بسیار بزرگ، شایستەتر) + (شا: پادشا، سەرۆک، میر، زۆر گەورە ف پادشـاه، امیـر، بسـیار

بزرگ، شایستەتر) + (یل: گەل، یەل، نیشانەی کۆ لە زمانی کوردیدا ف علامت جمع در زبان کردی)

بۆ نموونە: کورگەل= کورەیل، کورەکان

سوارگەل= سوارەیل، سوارەکان

گاگەل= گایل، گایەکان

**کەوابوو واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شای شایەکان، گەورەی گەورەکان، میری میران ف شاه شاهان، سردار سرداران

میری میران و شاشایل و ئەم چەشنە لەقەبانە لە سەردەمی دەسەڵاتی تەیمووری و سەفەویدا دەدرا بە شێخ و پیر و ساداتی جێی ڕێز و ئیحترام.[١]

١ فەرهەنگی فارسی ـ فارسی دێهخودا

# شێخەڵە

**شیخلە** **Şêxele**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمامی سەقز. ٢٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١١٨ کەسە.

وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(شێخ: پیری تەریقەت، سەید، عالمی دین، مورشید ف پیر طریقت، عالم دین، سید، مرشد) + (ە: های ناسێنەر ف های معرفه) + (ڵە: نیشانەی چکۆلە کردنەوە، نیشانەی بچووک کردن ف نشانە و پسوند تصغیر و کوچک کردن) وەک کووپەڵە، کۆرپەڵە، گۆزەڵە

**کەوابوو مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** شێخی چکۆلە، پیر و مورشیدی گچکە، سەیدی بووچک ف شیخ کوچک

لێرەدا بە دوو جۆر دەکرێ لێکی دەینەوە: ئەو شێخەی لەو شوێنە بووە، پیاوێکی چکۆلە و کورتەباڵا بووە؛ یا شێخی ئەو ئاواییە شێخێکی زۆر گەورە و نێوبەدەرەوە و مەشهوور نەبووە و تەنیا لەو شوێنەی ژیاوە یان لە دوو سێ ئاوایی دەوروبەری ناسراوە، بۆیە پێیان گوتووە شێخە چکۆلە یا سەیدە چکۆل.

لەم چەشنە وشەیە دێیەک هەیە بە نێوی «هەرمێلە» سەر بە ناوچەی سەرای سەقز. واتاکەی هەرمێ یا هەمرۆ یا امرود و گلابی‌یە کە پاشگر یا پەسوەندێکی «لە»ی پێوە نووساوە و وشەکەی چکۆلە کردۆتەوە. هەرمێ چکۆلە ف گلابی کوچک

# شیلاناوی

**شیلان‌آباد** **Şîlanawî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٢٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٠٧ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(شیلان: دارێکی دڕکاوی‌یە، بەری دارێکی دڕکدارە، میوەیەکە سوور و جوان و لە گۆیژ دەچێ ـ نێوی کچانەیە ف نوعی نسترن کوهی، ثمر نسترن کوهی، میوه قرمزی دارد به اندازه زالزالک ولی براق ـ نامی برای دختران ـ نسترن درختچه‌ای است خاردار دارای گل‌های سرخ و سفید.) + (اوی: وشەیەکە وەک پاشگر یا پاشوەند لەگەڵ نێو دێت. واتاکەی ئەوەیە ئەو شوێنە یا ئەو نێوە کە پاشگرەکەی پێوەیە زۆرە وەیا شتێک یا جێیەک ئالوودە بە ئەوە، وەک:

قوڕاوی ← کەوشەکەم قوڕاوییە.

خۆڵاوی← ئەو منداڵە دەستی خۆڵاوییە.

خوێناوی← دەستم بڕیوە و خوێناوییە.

ف پسوندی است که به دنبال اسم می‌آید و علامت آلودگی است. به عنوان مثال: زهرآلود، خون‌آلود، اشک‌آلود، گل‌آلود.

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** وا دیارە لە دەوروبەر و شاخ و کێوی ئەو دێیە داری شیلانی زۆر لێ بووە و بەم هۆیەوە نێویان ناوە شیلاناوی. ف به دلیل آنکه در اطراف این روستا درختچه‌ی شیلان «نسترن»

فراوان بوده و در حقیقت آلوده به این درختچه بوده، به این نام نامیده شده است.

مینۆرێسکی له کتێبی «مینۆرێسکی و کورد، وەرگێڕدراوی ئەنوەری سوڵتانی» به هەڵە باسی شیلانی کردووه و له واتاکەی نەگەیشتووه: «عونسووری شیلان بێگومان دەگەڕێتەوه بۆ ڕۆژانی ڕۆژوو گرتنی گشتی و دابەش کردنی شۆرباو.»[1]

* له زۆر شوێن ئاوایی به نێوی شیلان هەیه. وەک:

- دێی گردشیلان له سەردەشت
- کانی شیلان له بانه
- شیلان له سنه
- شیلاناوێ له مهاباد

۱ ل ٥٣، کتێبی «مینۆرێسکی و کورد» نووسراوی مینۆرێسکی، وەرگێڕ ئەنوەر سوڵتانی

# عەلیمردی

**Alî mrdî** **علیمُرده**

ئاواییەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ٢٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(عەلی: نێوە بۆ پیاوان ف نامی برای مردان) + (مردی: مردگ؛ مردوو؛ نازیندوو ف مرده)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** عەلیمردوو؛ عەلیمردگ ف عَلی مُرده

وا دیارە یەکەم جار لەو شوێنە پیاوێکی مردوو بە نێوی عەلییان ناشتووە و دواتر ئەو جێیە بووە بە ئاوایی. بەم نێوە دێیەک هەیە بە نێوی ئەحمەد مردی لە ناوچەی تیلەکۆ کە ئەویش ماناکەی ئەحمەد مردووە.

هێندێک کەس بەم نێوانە دەڵێن «عەلیمەردە: عەلی پیاوە؛ عەلی ئازایە ف علی مرد است» هەروەها «ئەحمەد مەردە: ئەحمەد پیاوە ف احمد مرد و شجاع است» کە ئەم بۆچوونە هەڵەیە و دەبێ وا بخوێندرێتەوە و بنووسرێ کە خەڵکی دێیەکە تەلەفوزی دەکەن.

لە شیعرێکی مەولەوی تاوەگۆزیدا ئاماژە بە وشەی «مەردە: مردوو» کراوە:

من خۆ دوور جە تۆ چون مەردە مەردە
هەر هام نە خەیاڵ ساڵ ویەردە[1]

---

١ دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل ٥٠٨

# عارەبەلەنگ

**عربلنگ** **Arebeleng**

ئـاواییەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ٥٦ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٦٦ کەسە.

وشەیەکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(عـارەب: عەرەب، عـارەو، نەتەوەیەکی گەورە لە ئاسـیادا ف عـرب، نـژادی بـزرگ در آسـیا) + (ە: هـای ناسـێنەر ف هـای معـرفە یـا شناسـایی) + (لەنگ: شەل، کەسێکی لە لاق نەقوستانە، پێ سەقەت ف پای لنگ، لنگپا، کجپا)

**کەوابوو مانای سـەرجەمی وشـەکە دەبێتە:** عەڕەبە شـەلەکە، عەرەبەکەی لاقی شەل بووە ف عربی کە لنگ بودە، عرب شلە

وا دیـارە لەو عەرەبـانەی لە عەربسـتانەوە هـاتبوونە ئێـران، هێنـدێکیان لە کوردسـتان بـوون و ئەو شـوێنەش یەکێـک لەو جێیـانە بـووە. دواتـر نێـوی دێیەکەیان گۆڕیوە بەعەرەبەشەلەی لەوێ ژیاوە.

«تەیمـووری لەنگ» یەکێک لەو پیـاوانەیە کە لە کارەسـاتێکدا لاقـی شـەل بووە و بە وشـەی «لنگ» ناسرا و بەنێوبانگ بووە.

لە زۆر جێ بە وشەی «عەرەب» وشـەیەکی تازەیان دروسـت کـردووە و بۆ نێوی ئاوایی و شار کەڵکیان لێ وەرگرتووە:

- عەرەبئاباد لە سونقوڕی کولیایی
- عەرەبئاباد، لە کەرەج
- عەرەب، لە بجنوورد
- عەرەبۆغڵووی سەروو لە سەقز
- عەرەبۆغڵووی خواروو لە سەقز

# قازانتا

**قازانتا** **Qazanta**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ١٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٢ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قازان: غازان شای ئێلخانی و کوڕی ئەرغوونخان بووە، ماوەی حوکم ١٣٠٤– ١٢٩٥ زایینی) + (تا: تی؛ توو: کێو؛ شاخ؛ وڵاتفکوه؛ سرزمین)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** وڵاتی غازانفسرزمین غازان

**دووهەم.** وشەکە تورکییە:

(قازان: مەنجەڵفدیگ) + (تا: تی؛ توو: کێو؛ شاخفکوه)

واتای وشەکە دەبێتە: ئەو کێوەی سەری وەک مەنجەڵ وایە؛ کێوی سەر مەنجەڵفکوه دیگ مانند

* لە بۆکان دێیەک هەیە بە نێوی «قازانەسەر».

**سێهەم.** وشەکە تورکییە:

قازینتی[1]:: هەڵکەندن؛ هەڵکەندن و گەڕان؛ پاشماوەی حەیوان و گیا و شتی دیکە کە لە کاتی هەڵکەندندا دەبیندرێتەوە؛ لەتوپەت و وردەشتی وافحفاری؛ کندوکاو؛ بقایای حیوانات و گیاهان و اشیاء کە در موقع حفاری بدست میآید؛ خردە؛ ریزە؛ قراضە

قازانتا هەر ئەم وشەی قازینتیە کە لە تەلەفوز و گوتندا وای لێهاتووە.

من بۆچوونی سێهەمم پێ ڕاستتر و بەڕێوجێترە.

---

١ ل ٧٥١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# قزڵوێڵ

**Qizilwêl** **قزل‌یول**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی چـڵچەمەی سەرشـیوی سـەقز. ئەم دێـیە چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قزڵ: زێڕ؛ تەڵا ف طلا) + (وێڵ: ئەم وشەیە تورکییە لە زمانی کوردیدا ئاڵوگۆڕی بە سەر هاتووە: یۆڵ: ڕێگا؛ ڕێ ف راه؛ جادە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ڕێگای تەڵایی؛ ڕێگەی زێڕین ف راه طلایی

هـۆی نێونـانی ئەم دێـیە بەو نێـوە ئەوەیە کە شـوێن و مەڵبەنـدێکی سەرسـەوز و پڕ گژ و گیایە و بۆ ئاژەڵداری زۆر لەبار بووە بەتایبەت لە کاتی هێرشـی تورکەکان کە ئەسـپێکی زۆریان بووە و زۆربەی کاروباری سپایان بە ئەسپ جێبەجێ کردووە. دیارە ئەو ئەسپانەش نیازیان بە گیا و ئاڵف و لەوەڕگا بووە و لەم ڕووەوە ئەو مەڵبەندە بۆ داگیرکەران و خەڵکەکە حوکمی زێڕی بووە.

# قوتانجغ

**قوطانجُق؛ اسلام آباد** **Qotanciq**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٣٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٧٩ کەسە. لە چەند ساڵ لەوە پێشەوە نێویان ناوە «ئیسلامئاباد».

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قوتان: کۆتان؛ پەچەمەڕ؛ شوێنێکی بە چیغ دەور درابێ و لە کێو و دەشت بۆ ڕاگرتنی مەڕ و بزن و کاوڕ و کاژیلە کەڵکی لێوەردەگرن. ف شبغاز: محوطەی کە با دیوار ترکەای درست شده و در صحرا برای خوابگاه گوسفندان از آن استفاده می‌شود) + (جغ؛ جیغ؛ جیق: وشەیەکە لە زمانی تورکیدا بۆ چکۆلە کردنەوەی نێو کەڵکی لێوەردەگیرێ ف کلمەای است کە برای تصغیر و کوچک کردن اسم در زبان ترکی بە کار می‌رود)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کۆتان و پەچەمەڕی چکۆلە. کۆتانی بچووک ف جایگاە کوچک در صحرا برای نگهداری گوسفندان.

# قوتڵوو

**قُتلو** **Qutlû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە. ١٧ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٨٣ کەسە.

ئەم وشەیە لە زمانی مەغوولیدا نێوی ژنانە:

١ـ نێوی ژنی ئەریق بووکا، کوڕی تۆلۆیخان و نەوەی چەنگیزخان، قوتلووخاتوون بووە.[١]

٢ـ هۆلاکۆخان حەوت کچی بوو، نێوی کچی شەشەمی، قوتلووقان بووە.[٢]

لە زمانی تورکیدا واتاکەی: (پیرۆز؛ مەبارەک ف مقدس؛ مبارک؛ خوش‌یمن؛ شگوندار[٣]

---

١ ل ٦٦٧ و ٦٨٣ کتێبی «جامع التواريخ» نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

٢ سەرچاوەی پێشوو

٣ ل ٧٧٨ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# قۆزلوو

**گلزار** **Qozlû**

دوو دێ بەم نێوە لە ناوچەی ئیمام هەیە:

ـ قۆزلووی سەروو (گلزار علیا)، ٩٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٨١ کەسە.

ـ قۆزلووی خواروو (گلزار سفلی)، ... ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ... کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە بە مانای: کوورِ؛ پشتچەماوە[ف]گوژپشت[1]

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە بە مانای: گوێز[ف]گردو؛ گردکان[2]

قۆزلوو لە دوو بەش پێکهاتووە: (قۆز: گوێز[ف]گردو) + (لوو: پاشگری پێوەند[ف]پسوند نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو شوێن و جێگایەی گوێز و داری گوێزی لێیە[ف]مکان و محل درختان گردو

چەند ئاوایی بەم نێوە هەیە:

ـ دێی قۆزلوو لە شاری گیوی پارێزگای ئەردەوێڵ (اردبیل)

ـ دێی قۆزلوو نزیک شاری گرمی سەر بە پارێزگای ئەردەبیل

ـ دوو دێی قۆزلوو سەروو و خواروو (علیا و سفلی) لە شاهیندێژ

ـ دێی قۆزلووجە لە شاهیندێژ

ـ قۆزلووی ئەفشار لەمیاندواو

ـ قەرەقۆزلوو لە میاندواو

---

١ ل ٧٩٠ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

# قۆچاغ

**قوچاق** **Qoçağ**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٤٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٤ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و دوو مانای هەیە:

**یەکەم.** قۆچاغ؛ قۆچاق: قارەمان؛ نەترس؛ بەهێزف بیباک؛ قهرمان[1]

**دووهەم.** قۆچاغ؛ قۆچاق: سەوەتەی گەورە کە دەسکی هەیەف سبد بزرگ دستەدار[2]

وشەی قۆچاغ لە کوردیشدا هەر بە مانای ئازا و کاری و بەدەستوبردە. زانا و هۆزان وەک پاڵەی قۆچاغ، پاڵەوانانە هاتوونەتە دەست و.... [3]

---

١ ل ٧٧٩ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

٣ ل ٤٢٧ کتێبی شەرەفنامە، وەرگێڕانی هەژار

# قوڵقوڵە

**Qulqule** قُلقُله

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٤٧ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٩٢ کەسە.

دێیەکی دیکەش هەر بەم نێوە هەیە کە چۆڵکراوە و سەر بە ناوچەی میرەدێیە و نزیک پیرئۆمەرانە.

**یەکەم.** لە بابەت وشەی قوڵقوڵان (چەشنێ هەناری کێوی)، لە فەرهەنگی «المحیط»دا ئاوا نووسراوە: "قولقولان چەشنێ هەناری کێوییە کە دەنکەکانی ڕەش و بۆنخۆشن."[1]

ئەم وشەیە لە نووسراوەکانی زمانی ئەکەدیدا (بابلی و ئاشووری) بە فۆڕمی قەلقەلانۆ qalqalanu نووسراوەتەوە.

**دووەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە «هەڵقوڵان»ی ئاو وەرگیراوە.[2]

هەڵقوڵان: بە فشار و تەوژم دەرچوونی تراو بەرەو ژووروو (هەڵقوڵانی ئاوی کانی، لە ناکاو پەیدا بوون جوشیدن آب از چشمه یا فوران هر مایعی، ناگهان پدیدار شدن»

مەبەست زۆری ئاوە کە لە زەوی هەڵدەقوڵێ و ئەو دێیەیانەیان بەم هۆیە نێو ناوە قوڵقوڵە.

---

١ ل ١٢٨ کتێبی «فرهنگ واژگان اکدی» نووسینی داوود سەلووم، وەرگێڕاوی نادر کەریمیان سەردەشتی

٢ فەرهەنگی هەنبانەبۆرینە، هەژار.

# قەبەغڵووجە

قَبَغْلوجە　　　　**Qebeğlûce**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٧١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٠٤ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قەبەغ؛ قەبەق؛ قەباق: پێشەوە؛ بەرەوە[ف] جلویی؛ پیشین) + (ڵوو: پاشگری نیسبەتە؛ خاوەن؛ جێ؛ شوێن) + (جە: پاشگر و نیشانەی چکۆڵە بوون[ف] نشانە و علامت تصغیر؛ علامت کوچک بودن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** دێیە چکۆلەی پێشەوە؛ ئاواییەکەی پێشەوە؛ آبادی کوچک جلویی

* ئاواییەکیش هەیە بە نێوی "قەبەغڵوو" کە سەر بە ناوچەی تەمۆغەیە.

# قەبەغلۆو

**قَبَغلو؛ قَباغلو** **Qebeğlû**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ١٥٨ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٢١ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەبەغ؛ قەبەق؛ قەبـاق: پێشـەوە؛ بەرەوە ف جلـویی؛ پیشـین) + (لـوو: پاشگری نیسبەتە؛ خاوەن؛ جێ؛ شوێن)

واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە: دێیەکەی پێشەوە ف آبادی جلویی

# قەپڵانتوو

قَپلانتو Qeplantû

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی سـەقز. ١٦٦ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٧١١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردی؛ فارسییە:

(قەپڵە؛ قاپڵە؛ قافڵە: قافلە؛ کاروان[ف]کاروان) + (ان: نیشانەی کۆ[ف]نشانەی جمع) + (توو: شوێن؛ جێ؛ وڵات؛ شاخ؛ کێو[ف]مکان؛ جا؛ سرزمین؛ کوه)

**مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** شـوێن و ڕێی کاروانەکـان؛ کـاروانەڕێ[ف]مکان و محل کاروان‌ها؛ محل عبور کاروان‌ها

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەپڵان؛ قـاپڵان: پڵینگ[ف]پلنگ) + (تـوو: شـوێن؛ جـێ؛ وڵات؛ شـاخ؛ کێو[ف]مکان؛ سرزمین؛ کوه)

واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە: وڵاتی پڵینگەکان؛ ئەو شـوێنەی پڵینگی لێیە [ف]سرزمین پلنگ‌ها؛ جایی کە پلنگ دارد.

لە سـەر وشـەی "تـوو" لە بەینی نووسـەران و مێژوونووسـان یەکدەنگی نییە و هەرکەسێ بۆچوونی خۆی هەیە:

ـ بەڕێز ئەحمەد کەسرەوی لە لاپەڕە ٢١٠ کتێبی «زبـان پـاک»دا دەڵێ لە ئازەربایجان بە "قافلانکوە" دەڵێن "قافلانتی" و لە خەمسـەش بە "ئەژدیهاکێو؛ اژدهاکوە" دەڵێن "ئەژدیهاتی؛ اژدهاتی".

ـ لە لاپەڕە ٤٩٤ی کتێبی "مێژووی ماد" (تاریخ ماد)، تا Ta پاشگر یا (پسوند)ی شوێن و جێیە. وەک: باروئاتا BaruaTa، ئیزیرتا پێتەختیماننا.

لە ئاوێستادا واتای وشەی "توو" شوێن و جێیە: لاپەڕە ١٢٣ی کتێبی "سرودهای زردشت" نووسینی بزرگمهر کیانی.

گاتوو Gatu ←گا (شوێن؛ جێ هەروەک "گا" لە وشەی قەڵاگادا) + توو: شوێن؛ جێ. واتای وشەی گاتوو دەبێتە: شوێن و جێفجایگاه.

ـ لە کتێبی "چەنگیزخان" نووسراوی هارۆلد لۆمب وەرگێڕدراوی ڕەشید یاسەمی، توو بە مانای شاخ و کێو هاتووە. وەک:

قەراتوو: (قەرا؛ قەرە: ڕەش؛ سیافسیاه + توو: شاخ؛ کێوفکوه)

مانای قەراتوو دەبێتە: کێوەڕەشفسیاەکوە

ـ سومێریەکان لە پێشدا بە وشەی "عیلامیان دەگوت هەلتەم Haltam و پاشان پێیان دەگوت هەتەم. ئەکەدییەکان بەو وشەیان دەگوت هەلتەمتی Haltamtîو هەتەمتی Hatamtî کە واتاکەی (وڵاتفسرزمین)ی هەڵتەمەکانە.[1]

چونکە لە زمانی ئەکەدییەکان وەک زۆرینەی زمانەکۆنەکان نێو (اسم) بە کار هێندراوە، کاتێ وشە موزافونئیلێە (مضافالیه) بووە ئاوایان «تلفظ» کردوە و کاتێکیش وشەکە بکەر «فاعل» بووە، پێیان گوتووە «ئیلامتوو: ئیلمتوو Elamtu.

ئیلامتوو: ئیلام + توو: وڵاتی ئیلامفسرزمین ایلام

هەڵتەمتی: هەڵتەم+ تی: وڵاتی ئیلامفسرزمین ایلام

---

١ لاپەڕە ٨٣ی کتێبی «تاریخ اجتماعی ایران در دوران پیش از تاریخ و آغاز تاریخ» نووسینی سەعید نەفیسی و لاپەڕە ١٤ی کتێبی «ایران در سپیدەدم تاریخ» نووسینی جۆرج گلێن کامێرۆن، وەرگێڕدراوی حەسەن ئەنووشە

هەروەک دیمان وشەگەلی: «توو؛ تی؛ تا» بە مانای وڵات؛ شوێن؛ شاخ و کێوە و لەو چەشنە وشانە لە وڵاتی کوردەواریدا زۆر و زەوەندە. وەک: هۆوەتوو؛ کەرەفتوو؛ مێتوو.

دیارە هەموو ئەو وشانەی پاشگرەکانیان «توو»ە، ماناکانیان شوێن و جێ نییە و دەبێ واتاکانیان لە یەک جیا کرێتەوە.

# قەرەول

**قرەگُل** **Qerewil**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ١٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٠ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە[١] و واتاکەی:

چاوەدێرێک کە لە دژ و قەڵای دەوروبەری شار و ڕێگاکان خەریکی نیگابانی و چاوەدێرییە؛ سەربازێک کە لە شوێنێک نیگابانی دەدا؛ ئێشکچی؛ نیگابان؛ پاسدار؛ کێشک؛ قەرەوڵ ف قراول؛ کشیک؛ نگاهبان

**دووهەم.** وشەی قەرەول تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەرە: ڕەش ف سیاه) + (ول: کورتکراو و سواوی وشەی "گۆل"ە کە ماناکەی حەوز و ئەستێرە ف کوتاه شده و تغییر یافتەی واژە "گۆل" به معنی حوض و استخر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەستێری ڕەش؛ حەوزی ڕەش ف استخر سیاه؛ حوض سیاه

ئاواییەک ڕاستەوڕاست و بێگۆڕان و سوان بە نێوی قەرەگۆل؛ ئەستێر ڕەش لە مابەینی بۆکان و میاندواو هەیە.

---

١ ل ٧٤١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# قەرەگوێز

**قرەگوز** **Qeregwêz**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ١٠٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٨٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و بۆ لێکدانەوەی سێ بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** (قەرە: ڕەش؛ سیاف سیاه؛ مشکی) + (گوێز: چاوف چشم)

**مانای تێکرای وشەکە دەبێتە:** چاوڕەشف سیاهچشم

**دووهەم.** چەشنێ شانۆی ڕەشەکان و بیبیجانخانمە لە تورکیە. پاڵەوانی شانۆکە نێوی قەرەگوێزە.[1]

**سێهەم.** نێوی دارێکە میوەکەی بە قەدەر سێوێکە. ئەو میوەیە لە پێشدا سوور و دوایی ڕەش دەبێ.[2] گوێزی ڕەش.

---

١ ل ٧٣٩ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

# قەرەچەل

قَرَچَر    Qereçel

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٤١ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٨٠ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکی؛ مەغوولییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەرە: ڕەش؛ سیا□سیاه) + (چەل؛ چەر؛ چار[1]: نێوی پیاوان□چَر؛ نام مردان در میان مغولها)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ڕەشەچار□چار سیاه

لاپەڕە ٤٧٤ فەرهەنگی شاهمەرەسی: مانای وشەی چار لە زمانی تورکیدا: ١- ڕۆشنایی؛ ڕووناکی□روشنایی ٢- تارا□روبندی که هنگام بردن عروس بر سرش میاندازند.

وێدەچێ هۆی نێونانی دێی قەرەچەل بەم نێوە ئەوە بێ کە سەرۆکی دەستەی داگیرکەر لە یەکەم هێرش و لە سەرەتادا نێوی قەرەچەر یا قەرەچار بووبێ.

**دووهەم.** واتای وشەی قاراچەر؛ قەرەچەر: چەشنێ نەخۆشی ئەسپە□ نوعی بیماری در اسبان

لە زمانی تورکیدا ئاتچەر (آتچر)یشی پێ دەڵێن.

---

١ ل ٧٣٥ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# قەرەبوغرە

قرەبُقره **Qerebûğre**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە. ٣٧ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٦ کەسە.

وشەی قەرەبوغرە تورکییە و بۆ لێکدانەوەی چوار بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** (قەرە: ڕەشفسیاه) + (بوغرە؛ بوغدە: گەنمفگندم)

**دووهەم.** قەرە بوقرا ئاڵقە یا بازنەیەکی ئاسنینە کە زنجیرێکی پێوەیە و دەیکەنە ملی دیل و زیندانی و بە گوڵمێخی تەویلەوە دەیبەستنەوە هەتا نەتوانێ ڕاکا.[1]

**سێهەم.** بوغرە یا بوقرە لە نێو مەغوولاندا نێوی پیاوانە. وەک:

ـ یەکێک لە سەردارانی ئەریق بووکا، پیاوێک بوو بە نێوی ئەبووکان کوڕی بوغرە یارغوچی لە هۆزی جەلایر.[2] ئەم بۆچوونەم پێ ڕاستە.

**چوارەم.** قەرابوغرا (قەرەبوغرە) شتێک یا ئامرازێک بووە کە بەردی بەرەو دوژمن پێ فڕێدەدرافآلتی کە با آن بە سوی دشمن سنگ پرتاب می‌کردند.[3] واتاکەی قەڵماسک یا فەلاخونە (فَلاخُن).

---

١ ل ٨٥ کتێبی «سیاحت درویشی دروغین در خانات آسیای میانه) نووسینی ئارمینیوس وامبێری

٢ ل ٦٦٩ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسینی ڕەشیدەدینی فەزلوڵلا

٣ ل ٧٧٢ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# قەڵاجوغە

**قلعەجقە** **Qelacoğe**

دوو دێی بەم نێوە لە سەقز هەیە:

١ـ قەڵاجوغەی سەر بە ناوچەی تیلەکۆ: ٥٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٨٢ کەسە.

٢ـــ قەڵاجـــوغەی ســـەر بە نـــاوچەی ســـاحێب. ٢٩ مـــاڵە و ژمـــارەی دانیشتووانی ١٣٠ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەڵا: حەسار؛ دز؛ دژ ف برج؛ قلعە؛ دژ) + (جوغە؛ جوقە: چکۆلە؛ بووچک ف کوچک)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** قەڵای چکۆلە ف برج و قلعەی کوچک.

بەم نێوە زۆر ئاوایی لە کوردستان و شارەکانی دیکەی ئێران هەیە:

- قەڵاجوق نزیک ئیمامزادە هاشمی شاری بیجار
- قەڵاجوقەی تیژتیژی شاری سنە
- قەڵاجوقەی نزیک خاکیبەگی شاری دیواندەرە
- قەڵاجوقەی نزیک ئاوایی سیامەنسووری شاری بیجاڕ
- قەڵاجوغەی نزیک ئاوایی ئۆتەمیشی شاری مەهاباد

و زۆر ئاوایی دیکەش.

# قەوخ

قَوخ **Qewix**

دێیەکە نزیک شاری سەقز کە ئێستا بووە بە گەڕەکێکی ئەو شارە.

٦٥٤ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٨٢٦ کەسە.

هەر بەم نێوە دێیەکی چکۆلە لە ناوچەی ئیمام هەیە کە ٢ ماڵە و لە بەینی دوو ئاوایی چنارە و جونیاندا هەڵکەوتووە.

لە بابەت ماناکەی چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** وشەکە تورکییە: (قەوخ؛ قۆوخ: پزدان؛ فوودانە؛ هەرشتێک بای تێکەن و هەڵماسێ ف بادکنک)

**دووهەم.** قوخ؛ قواخ: چەشنێ چنار ف درخت تبریزی

**سێهەم.** وشەکە تورکییە: قەوخ: تێداچوون و نەمان بە هۆی نەخۆشیەوە ف تباه شدن از بیماری

**چوارەم.** وشەکە تورکییە: قەوخ: قاوخ؛ قاوغ؛ قابغ: شتی ناوبۆش؛ خاڵی؛ قالۆر ف هرچیز میان‌تهی؛ ساقه خشک میان تهی

من پێم‌وایە مانای چوارەم لەوانی دیکە ڕاستترە.

# قۆڵەبلاغی

**Qolebilağî** **قِبلەبُلاغی**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ١١ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٦١ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە، بۆ لێکدانەوەی واتاکەی چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** (قۆڵ: غولام؛ بەندە؛ کۆیلە|ف|بندە؛ غلام؛ زرخرید) + (ە: های پێوەند و نیسبەت؛ پیتێکە وشەی دوای خۆی بە وشەی پێش خۆی دەچەسپێنێ|ف|های نسبت یعنی حرفی کە کلمە پس از خود را بە کلمەی ماقبل از خود پیوند میدهد) + (بلاغ: کانی؛ چاوە؛ هانی|ف|چشمە) + (ی: یای پێوەند و نیسبەت|ف|یاء پیوند و نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی غولام؛ کانی بەندە و کۆیلە|ف|چشمەی غلام؛ چشمەی بندە و اسیر

**دووهەم.** قۆڵەبلاغی نێویکی تورکییە:

(قۆڵ: دێو؛ زۆر گەورە|ف|دیو؛ بزرگجثە) + (ە: پیتی پێوەند|ف|حرف نسبت) + (بلاغ: کانی؛ هانی؛ چاوە|ف|چشمە) + (ی: یای پێوەند|ف|یاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی دێو؛ کانی گەورە|ف|چشمەی دیو؛ چشمەی بزرگ

**سێهەم.** وشەکە تورکییە:

(قۆڵە؛ قولا: ئەسپی زەردی ڕۆشن|ف|اسب بە رنگ زرد روشن) + (بلاغ: کانی؛ چاوە|ف|چشمە) + (ی: یای پێوەند|ف|یاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی ئەسپەزەرد [ف] چشمەی اسب زرد

**چوارەم.** وشەکە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قۆڵە؛ قۆڵای: هاسان؛ ساکار؛ لەبەردەست؛ موناسب؛ باش [ف] سهل؛ آسان؛ مناسب)

هەڵبەت لە زمانی تورکیدا ماناکەی «موناسب»ە بەڵام لە زمانی ئازەربایجانیدا بە مانای بێکەڵک و بەکارنەهاتووە. کەوابوو ماناکەی دەبێتە: کانی چاک و لەبەردڵان [ف] چشمە خوب و مناسب

# قەڵاگای کوڕکوڕ

**قلعەگاه کورکور** **Qelagai Kurkur**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ئیمام. ١٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٤ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قەڵا: حەسار؛ بورج؛ دژ ف دژ؛ قلعه) + (گا: جێ؛ شوێن ف محل؛ مکان؛ جا) + (کوڕکوڕ: قەتێ؛ کەت؛ قتک؛ چەشنێ باڵندەی وەک کۆترە ف مرغ سنگخوارە؛ باقرقره)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێگای باڵندەی کوڕکوڕ ف محل و مکان پرندەی مرغ سنگخوارە

لە کتێبی «فەرهەنگی باڵندە» نووسراوی ئەحمەدی بەحریدا هاتووە:

کوڕکوڕ باڵندەی تایبەتی ویشکانین. وەک کۆتر دەچن. باڵ و کلک و دەندووکیان درێژە. لاقیان قوڵە و تووکنە. لە بیابانی ویشک و بەیاردا دەژین. زیاتر ڕەنگی پەڕوباڵیان بۆرە و نێر و مێیان یەکڕەنگ نین. لە سەر عەرز هێلانە ساز دەکەن.

کوڕکوڕ چەند جۆرە:

- کوڕکوڕی بەرزگ خەنەیی ف کوکر شکم بلوطی

ـ کوڕکوڕی بەرزگ ڕەش[ف]کوکر شکم سیاه

ـ کوڕکوڕی بەرزگ سپی[ف]کوکر شکم سفید

ـ کوڕکوڕی خاڵخاڵ[ف]کوکر خالدار

ـ کوڕکوڕی ڕێڕێ[ف]کوکر راه‌راه

ـ کوڕکوڕی کلکدرێژ[ف]کوکر دم‌دراز

ـ کوڕکوڕی گەنمان[ف]کوکر گندمی

**دووهەم**. ئەم وشەیە (کوڕکوڕ) لە زمانی سومێری و کوردیدا بە مانای کێو و شاخ بووە و لە دواییدا بە زمانی سومێری بە مانای وڵات هاتووە.[١]

بە ڕای من واتای یەکەم ڕاستترە.

* چەند دێی دیکەش لە سەقز هەیە کە نێویان قەڵاگایە:

ـ قەڵاگای شەریف لە تیلەکۆ

ـ قەڵاگای خەلیفە لە تیلەکۆ

ـ قەڵاگای گوەرز (گۆدەرز) لە سەرا

١ ل ١٢٢، «لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی» دوکتور جەمال ڕەشید ئەحمەد

# قەرەناو

**Qerenaw** **قرەناو**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ٣٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٥٦ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قەرە؛ قەرا: ڕەش؛ سیا ف سیاە)[1] + (ناو: دارێکی درێژی نێوبەتاڵ کە ئاوی جۆگەی پێ دەپەڕێننەوە؛ دەرە؛ جۆگە؛ پلووسک ف چوب دراز میان‌تهی که در مجرای عبور آب قرار می‌دهند؛ دره؛ جوی؛ ناودان)[2]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** پلووسکی ڕەش؛ پلووسک یا قەمتەرەی ڕەش ف ناودان سیاه؛ کانال چوبی سیاه

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی و فەرهەنگی عەمید

٢ سەرچاوەی پێشوو

# قۆجە

قوجە                                                                 Qoce

ئەم وشـەیە نێـوی دوو مەزرایە: قـۆجەی سـەروو و قـۆجەی خـواروو لە ئاوایی باشماغ.

**یەکەم**. ئەم وشـــەیە تورکییـــە و بـــۆ نێونـــانی ئاواییەکـــان کەڵکـــی لێوەرگیراوە.

(قۆجە: پیر؛ گەورە؛ کۆنە؛ قەدیمی ف پیر؛ بزرگ؛ کهنە؛ قدیمی)[1]

**دووهەم**. وشەی قۆجە نێوی ئاواییە وەک:

ـ دێی قۆجە لە هەوشاری تیکاب کە دێیەکی کوردنشینە.

**سێهەم**. ئەم وشــەیە لە نێـو مەغوولـدا بـۆ نێـوی پیـاوان کەڵکـی لـێ وەرگیراوە. وەک:

چەنگیزخانی مەغوول لە ژنی دووهەمی، کوڕێکی بوو بە نێوی کۆلکان، ئەم کۆلکانە چوار کوڕی بووە کە کوڕی گەورەی نێوی قۆجە بووە.[2]

چەنگیز← کۆلکان ← قۆجە ← ئوردووی ← ئەبووکان

※ لە نێو کورداندا، قۆجە نێوی پیاوانە وەک: قۆجبەگی ئاغـای تورجـان لە سەردەمی قاجاردا.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ ل ٢٢٥ کتێبی «جامع التواریخ» ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

# قاقلاوا

**قاقل‌آباد** **Qaqlawa**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ١٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٩ کەسە.

**یەکەم.** قاقڵ: تێکوڵی هێلکە؛ بنی گیایەکە دەیخۆن ف پوستەی تخم پرندە؛ ریشەی گیاهی است خوردنی.

**دووەم.** وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قاقڵ: قاقڕ، زەوینێ کە گیای لێ نارِوێ، بێحاسڵ ف زمینی کە در آن گیاه نمی‌روید، دەکرێ بڵێین وشەکە قاقڕ بووە و گۆڕاوە بە قاقڵ و ئەوەش شتێکی ئاساییە. وەک: کەبابی بەرک بووە بە کەبابی بەڵگ.) + (ئاوا: ئاوەدان، جێ ژیان و مانەوە ف آباد، قابل سکونت و زندگی)

**واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئاوەدانکردنەوەی شوێنی قاقڕ؛ ئەو شوێنەی بەردەڵان و بێپیت و بەرەکەتە و گیای لێ ناڕوێ ئاوەدان کراوەتەوە ف محل بی‌حاصل با خاک فقیر، آباد و قابل سکونت شده است.

**سێهەم.** وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قاقڵ: کاکل، کاک + ل: کاکە چکۆل، برا چکۆل ف داداش کوچک) + (ئاوا: ئاوەدان کردنەوە، جێ ژیان ف آباد کردن، قابل سکونت و زندگی کردن)

**واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کاکل یا کاکە چکۆل ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە. ف داداش کوچیکه آن محل را آباد نموده است.

٭ لە ئاوایی جافرخانی خوڕخوڕە شوێنێک هەیە بە نێوی کاکل‌بەگ.

# قاراوا

| | |
|---|---|
| قاراوای سلێمان (ف قهرآباد سليمان) | Qaraway silêman |
| قاراوا گەورە (ف قهرآباد عليا) | Qaraway gewre |
| قاراوە چکۆلە (ف قهرآباد سفلی) | Qaraway çikole |
| قاراوای فرووزش (ف قهرآباد حومه یا فروزش) | Qaraway Frûzş |
| قاراوای تیلەکۆ (ف قادرآباد تیلکو) | Qaraway Tîleko |

وشـەی قـاراوا کوردییـە و لە ڕاسـتیدا «قادرئـاوا»یە بەڵام چـونکە پیتـی «د» تەلەفوز ناکرێ، پێی دەڵێن قائر یا قار. هەر ئەم نەخوێندنەوەی پیتی دال لە کوردیدا، بۆتە هۆی ئەوەی فارس و تورک قار بە قەهر (قهر: تۆران؛ زیز بـوون) بـزانن و لە وەرگێڕانـدا بە قـائراوا بڵـێن (قهرآبـاد). ئەمەش هـیچ پێوەندییەکی لەگەڵ نێوەکە نییە و سەرتاپا هەڵەیە.

# قامیشەڵە

**قامیشَلَە** **Qamîşele**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە. ٢٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٢ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قامیش: ڕووەکێکی باڵابەرزی نێوبەتاڵە؛ نەیفنی) + (ە: پیتی ناسێنەرف حرف معرفە) + (ڵە: پاشبەندی چکۆلە کردنەوەی نێو وەک کووپەڵە؛ دیزەڵە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** قامیشی چکۆلە؛ قامیشی بچووکفنی کوچک

**دووهەم.** وشەکە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قامیش: نەیفنی) + (ە: پیتی ناسێنەرفحرف معرفە) + (ڵە: سواوی وشەی ڵان: جێ؛ شوێنفمحل؛ مکان)

کە مانای سەرجەمەکەی دەبێتە: قامیشەڵانفنیستان

* دێیەکی دیکەش بەم نێوە «قامیشەڵە» لە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز هەیە.

# قشلاغ

**قِشْلاق** **Qişlağ**

قشلاغ یا قشلاق یا قیشلاق له بنەڕەتدا وشەیەکی تورکییە. ئەم وشەیە لە بەرانبەر وشەی یەیلاقە. قشلاغ بە جێ و شوێن و وڵاتێک دەڵێن کە گەرمە و خەڵکی کۆچەر کە لە ژێر چادر و خێوەتدا دەژین، زستانانە ڕووی تێدەکەن و لەوێ دەمێننەوە. کەوابوو قشلاغ یا قشلاخ بە وڵاتی گەرمێن و گەرمەسێر دەڵێن. لە وڵاتی خۆمان بەو شوێنانەی لەوەڕگە بووە و ڕەشماڵیان لێ هەڵداوە و لە چاو شوێنەکانی دیکە گەرمتر بووە پێیان کوتووە قشلاخ. دیارە ئەم قشلاخانە لە سەرەتادا جێی خەڵکی کۆچەر بووە و پاشان بەرەبەرە ماڵیان لێ ساز کردووە و لەوێ ماونەتەوە و بووە بە جێژیانی هەتاهەتایی.

لە دەوروبەری سەقز چەند ئاوایی هەیە بە نێوی قشلاغ. بەم چەشنە:

١ـ قشلاغی ئەفغانان (قشلاغی خاتڕابی): ئەم دێیە سەر بە ناوچەی تەمۆغەیە و ٤٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٩٤ کەسە. ئەم قشلاغە یا ئەو شوێنە گەرمە وا دیارە بنەماڵەکانی ئەفغانی لێ ژیاون و بەم چەشنە نێوی ئەفغانی بە سەردا بڕاوە. بەڵام ئەم ئەفغانیانە کێ بوون و بۆ لە کوردستان بوون؟ من پێموایە پاش لە سەرکار لابردنی سوڵتان حوسێنی سەفەوی، لە ساڵەکانی ١١٠٢ تا ١١٠٨ هش (١٧٢٣؛ ١٧٢٩ز) مەحموود و ئەشرەفی ئەفغان

له شـاری ئیسـفەهان حکـوومەتی ئێرانیـان دەکـرد.[1] دەبـێ هەر لەو سـاڵانەدا ئەفغانیەکـان ڕێگایـان بـۆ کـرابێتەوە و پەڕیـوەی کوردسـتان بـووبێتن و ئەو قشڵاغەیان بە دەستەوە بووبێ و لەوێ بۆ ماوەیەک ژیابن.

٢ـ قشـڵاغی قـازی (قشـلاق قاضـی): دێیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشیو. ١٢ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٦ کەسە. ئەم دێیە لە بەینی دوو ئاوایی هێجانان و خەییەر هەڵکەوتووە. ئەم ئـاواییە "قشـڵاخی ئەخەوان"یشـی پێ دەگوترێ. ئەو ناوە بە مانای گەرمەسێری قازییە.

٣ـ قشڵاغی مەلا (قشلاق ملا): ئەم ئاواییە نێوێکی دیکەی هەیە و ئەویش قشڵاغی سەیدفەرەجە. ١٠ مـاڵە و ژمـارەی دانیشـتووانی ٣٠ کەسـە. ئەو دێیە لە دەستی ڕاسـتی سـەرەتای جادەی سـەقز؛ سەرشـیو هەڵکەوتـووە. مانـاکەی «گەرمەسێری مەلا»یە.

٤ـ قشـڵاقی پـرد (قشـلاق پل): لە ٣٠ کیلـۆمێتری جادەی سـەقز؛ مەریـوان هەڵکەوتـووە. دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیو. ٤٠ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٦١ کەسـە. لە بەینی ئەو دێیە و ئـاوایی بـارام، پردێک هەڵبەسـتراوە و ڕێگـای ئاواییەکـانی تاویشـە و قشـڵاغی مـلەش هەر لە سـەر ئەم پردەوە تێدەپەڕێ. ڕەنگە نێوی پردیش هەر بە هۆی ئەم پردەوە لەسـەر ئـاوایی قشـڵاغی پـرد دانـدرابێ. ئەم ئـاواییە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشیوە.

٥ـ قشڵاغی ساڵەبەگ (قشلاق صالحبیگ): ئاوایییەکە لە سەر ڕێی سەقز؛ بانە هەڵکەوتووە و بەینی سەقز و ئەو دێیە ١٠ کیلۆمێترە. ٥٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٩٢ کەسە و سەر بە ناوچەی تەمۆغەیە.

---

[1] ل ١٣ و ١٦ کتێبی «رستم التواریخ» محەمەد هاشم ئاسەف

٦ـ قشلاغی مله (قشلاق مله): ئاواییی‌یەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە. ٢٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٥٩ کەسە. ئەم نێوە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قشلاغ؛ قشلاق: گەرمێن؛ گەرمەسێر؛ شوێنێکی کەش‌وهەوایەکی گەرمی هەیە) + (مله: ڕکەبەری؛ کێبەرکێ؛ زینوو؛ بستوو‌ف‌گردنەی کوه)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** گەرمەسێری بستوو؛ جێمانەوە و گەرمەسێری کەل‌ف‌گرمسیر و محل اسکان گردنەی کوه

٧ـ قشلاغی ئاغاگەورە (قشلاق آغاگوره): دێیەکە سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە. ٦٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤١٠ کەسە. نێوێکی دیکەی ئەم ئاواییی‌یە قشلاغی ئەمین‌بەگە.

٨ـ قشلاغی ڕەزا (قشلاق رضا): دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٢٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٥٠ کەسە. ئەو دێیە لە کەناری ڕۆژهەڵاتی ئاوی سەدی بۆکان هەڵکەوتووە.

٩ـ خۆش‌قشلاغ: ئاواییی‌یەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ٨١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٩١ کەسە.

مانای ئەم وشەیە: قشلاغێکی خۆش ئاو و هەوا؛ وڵاتێکی گەرموگوڕ و جێیەکی خۆش‌ف‌منطقه‌ای خوش آب و هوا با هوایی نسبتا گرم برای فصول سرد.

١٠ـ قشلاغی حاجی شەهاب لە بۆکان، لە سەر چۆمی جەغەتوو.

# قۆڕەدەرە

**قورَه دَرَه** **Qore dere**

ئـاوایییەکە سـەر بە نـاوچەی میـرەدێ. ۳۹ مـاڵە و ژمـارەی دانیشـتووانی ۱۹۸ کەسە. ئەم نێوە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(قـۆڕ: هەراو؛ گوشـاد؛ لەبەریەک ڕەواوفگشـاد؛ از حالـت طبیعـی خـارج شـده و گشـاد شـده) + (ە: هـای ناسـێنەرفهـای معـرفه) + (دەرە: شـیو؛ دۆڵ؛ گەڵیفزمین دراز و کشیده میان دو رشته کوه؛ راه میان دو کوه؛ دره)

مانای سەرجەمی وشەی قۆڕەدەرە دەبێتە:

شیو و دۆڵی هەراو؛ دۆڵ و دەرەی گوشادفدره گشاد؛ دره بزرگ شده

ئاوایییەکانی سەقز بە هۆی ئەوەی لە ناوچە شـاخاوی و کەندولەندەکانـدا دروست کراون، نێوەکەیان وشـەی «دەرە»ی پێوەیە. هەڵبەت ئەوە تـایبەت بە سـەقز نـیـیە و لە دێ و شـارەکانی دیـکەش دەبینـدرێ. تەواوی ئەو دێیـانەی سەقز کە دەرەی پێوەیە بریتین لە:

۱ـ دەرەوەزانـی سـەروو (دەرە: شـیو؛ دۆڵفدره) + (وەز: گـوێزفگـردو) + (ان: نیشـانەی کـۆ) + (سـەروو: بـاڵافبـالایی) کە دەبێـتە دۆڵ و دەرە و شیوی گوێزەکانفدرەی درختان گردو

۲. دەرەوەزانی خواروودرەوزان سفلی

۳. دەرەزیارەتی سەروو: درەزیارت علیا

٤. دەرەزیارەتی خواروو: درەزیارت سفلی

٥. دەرەویانی سەروو: (دەرە: شیو؛ دۆڵ ف دره) + (ویان: ئاوەز؛ هۆشیاری؛ ئەوین ف عشق؛ هشیاری) کە دەبێتە شیو و دۆڵی عیشق و ئەوین و وریایی ف دره عشق و هوشیاری و دوست داشتن.

٦. دەرەویانی خواروو: درەویان سفلی

٧. دەرەسمایلە: دره اسماعیله. شیوی ئیسماعیل ف دره اسماعیل

٨. دەرە شێخان: دره شیخان

٩. دەرەتفێ: (دەرە: شیو؛ دۆڵ ف دره) + (تفێ: توو؛ تووی شیرین ف توت)

١٠ـ دەرەقووڵە: بە مانای شیو و دۆڵی قووڵە ف درەی عمیق. لە نووسینی ڕەسمیدا دەنووسن: «دره قبله» کە هەڵەیە.

١١ـ دەرەپەمەدانی کولتەپە: درەپنبەدان؛ دۆڵ و دەرەیەکی پەمۆیان لێ کردووە.

١٢ـ دەرەپەمەدانی دەوروبەری شاری سەقز. شیو و دۆڵێکی پەمۆیان لێ چاندووە.

١٣. دەرەی ئاوی: درەی آبی. دۆڵ و شیوێکی ئاوی پێدا دێ. شیوێکی ئاوی زۆرە.

١٤. دەرەهوان (دەرە: دۆڵ؛ شیو ف دره) + (هو: چاک؛ باش ف خوب؛ نیک) + (ان: نیشانەی کۆ ف علامت جمع) کە سەرجەم دەبێتە شیو و دۆڵی چاکان ف درەی نیکان

١٥. سیادەری سەروو: ڕەشەدۆڵی سەروو ف سیاه درەی بالا

١٦. سیادەری خواروو: سیاەدرەی سفلی. سیاهدر کهنه

١٧. وەشەدەرەی سەرشیو: خوشەدرەی سرشیو. دره سبز و بانشاط

١٨. وەشەدەرەی کولتەپە: خوشەدرەی کلتپە. دره سبز و بانشاط

۱۹. سەردەرە: سردره؛ بالای دره؛ رأس دره

۲۰. دۆزەخدەرە: دوزخ‌دره؛ دوزخدره؛ درەای به مانند جهنم. دره دوزخ

۲۱. دۆڵەسیر: دەرە و شیوێکی سیری لێیە؛ شیوی پڕ لە سیر ف درەی سیر؛ درەی پر از سیر

۲۲ـ هەرمێ دۆل (هرمیدول): دۆڵ و شیو و دەرەی هەرمێ ف درەای با درختان گلابی



وێنەی ۱۰. دێی دۆزەخدەرە

# قیلەسوون

**قیلَسون؛ قَیلَستون** **Qîlesûn**

دێــیەکە ســەر بە نــاوچەی ســەرا. لە ســەر جــادەی ســەقز بــۆ ســنە هەڵکەوتووە. ١١٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٩٩ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قیل: قیر: بەنداو؛ بناوان ف آب‌بند؛ سد کوچک) + (سوون: تازە ف جدید؛ تازە)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەنداو و بناوانی تازە ف آب‌بند جدید

**دووهەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قیل؛ قیر: دەشتێکی ڕێک و تەخت ف دشت صاف و هموار) + (سوون: کەنار؛ تەنیشت؛ لا ف کنار؛ طرف؛ جانب)[2]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** نزیکی دەشت؛ کەناری دەشت ف کنار و طرف دشت

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

٢ سەرچاوەی پێشوو

مەبەست ئەوەیە ئاوایی قیلەسوون لە لای دەشتێکی ساف و ڕێک و تەخت هەڵکەوتووە.[ف] روستای قیلەسون (قیلسون) در کنار دشت واقع شده و این با واقعیت تطبیق دارد.

**سێهەم.** ئەم وشەیە سانسکریتیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(قیل: قیر: زەرد[ف] زرد؛ لە ڕۆژگاری زۆر کۆن بۆ ئاماژە بە کانزا باییدارەکان کەڵکی لێ وەردەگیرا) + (سوون؛ سونو: کوڕ[ف] پسر)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کوڕی زەرد؛ کوڕی زێڕ؛ زێڕە[ف] پسر زرد؛ پسر طلایی؛ پسر زرین.

---

١ کتێبی «ئاریاییەکان»، گوردون چایلد ـ ل ١٢٧ و ١٣٦

# قەڵەننەر

قَلَندَر Qelener

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ١٠٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٨٠ کەسە.

قەڵەنەر «قلندر» وشەیەکی فارسییە و یەک بەشە:

(قەڵەنەر: قەڵەندەر، فەقیر، بەلەنگاز، عەبدال، دەروێش، بەستەزمان و بێزیان ف بیچیز، خانەبەدوش، بیچارە و خجالتی)

قەڵەنەر بە کەسێ دەڵێن کە دڵ و دەروونی لە خۆشەویستی ماڵ و منداڵ و هەموو شتی دنیایی پاک بووبێتەوە. قەڵەنەر گەیوەتە مەرتەبە و پلە و پایەی ڕوحی و دەستی لە هەموو شتێکی مادی بەرداوە و ئارەزوومەندی جەماڵ و جەلالی «هەق»ە.

لە سەر ئاستی خاکی ئێران زۆر جێ هەیە نێوی یا بەشێک لە نێوەکەی قەڵەندەرە:

* قەڵەندەر، دێیەکە لە مابەینی هەرسین و خوڕڕەماوا
* قەڵەندەر، دێیەکی شاری ئەهەرە
* قەڵەندەر: دێیەکی شاری دێلفانی خوڕڕەماوایە
* قەڵەندەر: دێیەکە لە شاری بیرجەند
* قەڵەندەر: شاعیرێکی خەڵکی کرمان و لە دەروێشەکانی شا نێعمەتوڵڵای وەلی بووە.

واتای تێکڕای وشەکە: دەکرێ بڵێین کاتی خۆی (زۆرتر لە دەورەی مەغوول و ئیلخانەکان) لەم شوێنەدا پیاوچاک و پیر و لەخوداترسێکی لێ بووە کە هەر وەک نموونەی سەرەوە نێوی قەڵەنەر «قەڵەندەر» و جێی ڕێز و خۆشەویستی خەڵکی ناوچەکە بووە و بەم بۆنەیەوە نێوی دێیەکەیان کردبێتە قەڵەندەر.

# کاوەملە

**Kawemle** **کاوملَه**

ئـاوایییەکە سـەر بە نـاوچەی چـلچەمەی سەرشـیوی سـەقز. ٣٠ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٧٠ کەسە.

بۆچوونی یەکەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(کاو: کەژ و کۆ و کەمەری سـەخت؛ چیای بەردین؛ زەردومـای سـاف و سـەخت؛ شـاخ؛ کێـو|ف| کـوە سـنگی؛ کوهسـتان سـنگی و سـخت) + (ە: هـای ناسێنەر|ف| های معرفە) + (ملە: بستوو؛ زینوو؛ گەردەنە|ف| گردنەی کوە)

**مانـای سـەرجەمی وشـەکە دەبێتە:** مـلە و گەردەنەی بەردیـن؛ بسـتووی بەردین و سەخت|ف| گردنەی سخت و صخرەای.

وشەی «کاو» کە بە مانای زەردومـای سـاف و سـەخت و چیـا و بەردە، لەگەڵ وشەی «کاوان» کە ئەویش هەر بە مانای بەرزایی شـاخەکان و چیـای بەردیـنە، لە شـیعرەکانی شـاعیری پـایەبەرز مەولەوی تاوەگۆزیـدا بە زۆری دەبیندرێن:

* ئەوەخت پای کاو هەرد دڵ تەم بۆ
ئەساسەی دووری ئازیزان جەم بۆ
* مەشنیە چینچین چنوور نە کاوان
توخوا ماتەم بە هاژەی وەفراوان[١]

بۆچوونی دووهەم. وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

---

١ دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل ٣٣ و ١٦١

(کاوە: نێوی پیاوانە؛ لە نێوی کاوەی ئاسنگەر وەرگیراوە ف نامی برای مردان؛ اشارە بە نام کاوەی آهنگر دارد) + (ملە: بستوو؛ زینوو؛ گەردەنە ف گردنەی کوە)

**مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** گەردەنەی کاوە؛ ئەو ملە و گەردەنەیەی بە نێو کاوە کراوە ف گردنەی کاوە؛ گردنەی منسوب بە کاوە.

بۆچوونی سێهەم. ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کاوە: کەوە؛ ئابی؛ شین؛ کەوگ ف کبود؛ آبی روشن) + (ملە: بستوو؛ زینوو؛ گەردەنە ف گردنەی کوە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ملەی شین؛ گەردەنەی شین؛ بستووی ئاوی ف گردنەی آبی؛ گردنەی کبود.

* لە هەورامان و لە درێژەی کێوی شاهۆ، گەردەنەیەکی لێیە بە نێوی «ملەکەوە» کە لەگەڵ «کاوەملە»کەی جێباسی ئێمە هەریەک واتایان هەیە.[1]

---

١ کتێبی «ڕەسەنایەتی زمانەکەت بناسە»، نووسینی محەمەدئەمین هەورامانی، ل ٢٩

# کوچک

**کوچک** **Kuçik**

دوو دێ بەم نێوە لە ناوچەی سەرا هەیە:

ـ کوچکی خواروو (ف کوچک سفلی) ٤٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٢٢ کەسە.

ـ کوچکی سەروو (ف کوچک علیا) ٥٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٧١ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** لە نێو مەغوولاندا نێوی کچانە. وەک: کچی گەورەی ئەحمەد تگۆدار (کوڕی حەوتەمی هۆلاکۆ) نێوی کوچوک بووە.[١]

**دووهەم.** لە نێو کورداندا بە مانای بەرد یا سەنگە ف سنگ

**سێهەم.** لە زمانی تورکیدا بە مانای حەیوانی بارهەڵگر؛ حەیوانی بارکێشە ف حیوان بارکش

**چوارەم.** لە زمانی تورکیدا بە کەسێک دەڵێن کە لە پشت سەری کەسێکی دیکەوە سواری ئەسپ دەبێ ف شخص دومی از دو نفر کە بر پشت اسب سوار میشود.

---

١ ل ٧٨٣ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

**پێنجەم.** لە زمانی تورکیدا بە مانای: ورد؛ تفڵ؛ منداڵ ف خرد؛ کودک؛ طفل

**شەشەم.** لە زمانی تورکیدا بە مانای: توڵەسەگ؛ بەچکەسەگ ف تولەسگ

**حەوتەم.** ئەم وشـەیە کوردییـە: پیـاوانی ئیـزەدی ئەوانەی لە شـەنگال و دەشتی مووسڵ و جزیرەی سووریە و لە تورکیا دەژین بریتین لە:

١ـ میری گەورە ٢ـ پسمیر ٣ـ بابەشێخ ٤ـ کوچەک ٥ـ فەقیر ٦ـ مورید ٧ـ قەووالە[1]



وێنەی ١١ـ دێی کوچکی سەروو

١ مێژووی موزیکی کوردی ـ محەمەد حەمەباقی

# کەچەڵ مینگان

**کَچَل مِنگان** **Keçel mîngan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٥٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٤٢ کەسە. خەڵکی ئەم ئاواییە جارجار «کەچەڵمیان»یشی پێ دەڵێن.

ئەم وشەیە مەغوولیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(**کەچەڵ**: لە نێو مەغوولاندا وشەیەک هەیە بە نێوی "چار Char". ئەم وشەیە لەگەڵ وشەگەلی دیکە تێکەڵاو دەبێ و نێوێک پێکدێنێ. وەک:

ـ قەراچار؛ برکەچار؛ بایاچار؛ کەچار[1]؛ چکەچار

"چار" لە زمانی تورکیدا دوو مانای هەیە: ١ـ ڕووناکی ٢ـ تارا ف ١ـ روشنایی ٢ـ روبند عروس

وشەی "کەچار kechar" کە نێوێکی مەغوولیە لە نێو کوردانددا بووە بە "کەچەڵ kachal". ئەو ئاڵوگۆڕەی پیتی "ڕ" بە "ل" و بە پێچەوانە لە زمانی کوردیدا شتێکی نەناسراو و نامۆ نیە. وەک:

ـ ماڵی ئێمە ← ماری مە (هەندێک لە لادێییەکانی دەوروبەری هەولێر دەڵێن)

ـ چڵکن ← چرکن

ـ کەبابی بەڵگ ← کەبابی بەرگ

ـ بڵێسەی ئاور ← لە بنەڕەتدا برێسەی ئاور بووە

ـ باڵ ← وارە (لە ئاوێستادا)؛ بارەک لە پەهلەویدا[2]

---

١ ل ١٧١ و ٥١٠ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

٢ کتێبی وشەنامە، جەمال نەبەز

هەروەها وشەی قەرەچەل کە نێوی دێیەکی ناوچەی میرەدێی سەقزە لە بنەڕەتدا قەرەچەر (قەراچار) بووە.

لە وشەی کەچار؛ کەچەڵ بە دوو مەبەست کەڵک وەردەگیرێ:

١ـ لە نێو مەغوولاندا نێوی پیاوانە. وەک: نانککەچار کە پیاوێک بووە لە تۆرەمەی جووچی کوڕی چەنگیزخان

٢ـ نێوی شوێن و ناوچەیە. وەک: چەنگیزخان و ئۆنک قەرەوڵ و نیگابانی خۆیان لە شوێنێک دانابوو بە نێوی (چاکاچار یا چەکەچار)[1]

**مینگان:** منگان؛ مینگغان. لە نێو مەغوولەکاندا تەواوی هۆز و تیرە و بنەماڵەکان بە دەستەگەلی ١٠ و ١٠٠ و ١٠٠٠ کەسی دابەش کرابوون. هەروەها سپا و هێزی چەکداریشیان هەر بەو چەشنە دابەش دەکرا.[2]

نێوی ئەو دەستانە ئاوا بوون:

ـ دەستەی دەیە: ئەربان Arban

ـ دەستەی سەدە: جائوون یا جاقوون Jaoon

ـ دەستەی هەزارە: مینگغان Mingğan

ـ دەستەی دەهەزارە: توومان Toman

هەروەک دیتمان بە دەستەیەکی هەزارکەسی سپا و هەروەها بە فەرماندە و سەرۆکی ئەو دەستەیان دەگوت مینگغان یا مینگان یا هەزارە.

جا چۆن ئەو نێوەیان لەسەر ئەو ئاواییە داناوە؟

من پێموایە زۆربەی ئەو نێوە مەغوولیانە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی حوکمی ئێلخانەکان. مەغوولەکان لە هۆلاکۆوە کە لە ساڵی ١٢٥٦ی زایینی ئێرانی بە تەواوی داگیر کرد هەتا ڕووخانی حوکمی ئەبووسەعید لە ساڵی

---

١ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

٢ سەرچاوەی پێشوو

١٣٣٥ی زایینی بە ئێلخانەکان ناسراون. دەبێ نێوی سەرۆکی ئەو سپایەی ئەو گوندەی داگیر کردووە، "کەچار" بووبێ. جا چونکە سپاکەی ژێر فەرمانیشی هەزارە یا مینگغان بووە، "کەچار مینگغان"ەیان بە سەر ئەو دێیەدا بڕیوە. پاشان وردە وردە ئەم پیت و وشانە لە سەر زاری خەڵک سواون هەتا ئێستاکە بووە بە کەچەڵ مینگان.

هەندێ بۆچوونی هەڵە هەیە کە ئاماژەیان پێ دەکەین:

- پیاوێکی کەچەڵ بووە کە شەڕکەرێکی ئازا بووە و لە شەڕدا خوێنی هەزار کەسی ڕشتووە و نێوی ئەم کەچەڵەیان بۆ نێوی ئەو ئاوایییە هەڵبژاردووە.

یا هەندێ کەس دەڵێن "کاچاڵمیان" یانی شوێنێکی لە میان و نێوەڕاستەکەی چاڵی لێیە.

# کەمەتوو

**Kementû** **کَمَنتو**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٥٠ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٤١ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە.

(کەم: پـێچەوانەی زۆر[ف]کـم؛ انـدک؛ مقـدار نـاچیز) + (تـوو: تـۆم؛ ئەو دەنکانەی بە زەویەوەی دەکەن[ف]تخم؛ بذر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** تووی کەم؛ تۆوی کەم؛ تۆمی کەم[ف]بذر کم؛ تخم کم

مەبەست لە «کەمتوو» زەوی و شوێنێکە تووی کەم پێوەدەکەن. هۆی ئەو کارەش ئەوەیە خاکی زەویەکە چاک و بە هێز نییە و دەبێ تووی کەم پێوەکەن. دەنا ئەو تووەی پێوەی دەکرێ بەرناگرێ و شین نابێ[ف]بذر کم؛ تخم کم. منظور از این واژە زمینی است کە خاک حاصلخیز و پر قدرتی ندارد بناچار باید بذر کمتری روی آن پاشید تا بتواند سبز شود.

لە نووسینی ڕەسمی و ئیداریدا دەنووسرێ «کەمەنتوو؛ کمنتو» کە هەڵەیە.

وشەی بەرانبەری «کەمەتوو»، «کەیلەتوو»ە.

# کەیلەتوو

کَیْلَتو                                                  Keiletû

مووچە و مەزرایەکە لە نێوان دوو ئاوایی قشلاغی مەلا و کەمەتوو. دەڵێن زۆر لەوە پێشتر دێ بووە بەڵام ئێستا تەنیا مەزرایەکە و شوێنەواری ئاوەدانی لێ نەماوە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەیل: پڕ؛ پڕاوپڕ؛ دارماڵ[ف] پر؛ لبریز) + (توو: تۆو؛ تۆم؛ تۆوی سەوزی و دەخڵودان[ف] بذر؛ تخم)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** پڕتوو؛ شوێنێکی تووی زۆر پێوەبکرێ[ف] پر بذر؛ متراکم

کەیلەتوو یانی ئەو زەویانەی بەپیت و بەرەکەتن. خاکی چاک و بەهێزیان هەیە و وەرزێڕ تووی زۆریان پێوەدەکا چونکە خاکەکەیان هێز و قوەتی سەوزکردنی تووەکانی هەیە و دەتوانن بەرهەمی چاکیان بێ.

ئەم وشەیە بە تەواوی پێچەوانەی وشەی «کەمەتوو»ە و لە نزیک یەک هەڵکەوتوون.

# کرووز

**Krûz** **کروز**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـانی سـەقز. ٢٧ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٥٤ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و چەند مانای هەیە:

١ــ بەو کەسـانەی بە هـۆی هـاوڵە (خـورویٚرکە: آبـلە) دەموچـاو و سەروڕوویان کونکون (سوراخ سوراخ؛ چالە چولە) بووە دەڵێن کرووز یا گڕوێ.

٢. شووتی و شتی وا کە جێجێ مریشک وباڵندەکانی دیکە دەندووکیان لە تۆخڵی (پێستی) دابێ پێیان دەڵێن کرووز.

٣ــ بە بـۆنی سـووتانی ئێسـک و چەوری و خـوری و شـتی وا دەڵـێن بۆکرووز **ف** (بوی سوختگی استخوان و پشم و ...)

٤ـ بە شـتی بێخێروبێـر و بەکارنەهـاتوو دەڵـێن کـرووز. بـۆ وێـنە کـاتێ دەڵێن ئەو ئاواییە کرووسە یا کرووزە، ماناکەی ئەوەیە هـیچ بەروبوومێکی لێ هەڵناوەرێ و هیچی لێ دەست ناکەوێ.

# کەرێزەی گڵی

**کهریزه ایوبی** (گلی) **Kerêzey glî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٧٧ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٠٣ کەسە.

ئەم دێیە «کەرێزەی ئەیووبی»شی پێ دەڵێن.

کەرێزەی گڵی نێویکی کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەرێزە: لە ژێر زەوی ڕەهەندێک لێ دەدەن و لە چاڵێکەوە بۆ چاڵێکی دیە ئاو دەگوێزنەوە تا ئاو لە سەر زەوی و لە سەرچاوەوە دەردەکەوێ. کەرێزەی وایە زۆ دوور و درێژە و جاری وایە دەگاتە چەند کیلۆمیتر کە چەند چاڵ یا گومانەی هەیە.)

زۆرتر لەو شوێن و وڵاتانەی کەم ئاو و بێئاون کەرێز یا کارێز لێ دەدرێ. لە کوردی و فارسیدا بە چەند جۆر نێوی دێنن. وەک: کەرێزە، کارێزە، کاریز، کەهرێز، کاهرێز. لە عەرەبیدا پێی دەڵێن: قەنات.

هۆی ئەوەی لە کوردی و فارسیدا بەو ڕەهەند و ئاوی ژێرزەمینییە گوتراوە کارێز یا کەرێزە، ئەوەیە کە بۆ تاقی کردنەوە و شوێنپێ هەڵگرتنی ئاوەکە، کایان کردۆتە چاڵەکانەوە، تا ئەوەی لە سەرچاوەی کارێزەکەوە وەدەر کەوتووە و بیندراوە. ف نقبی است که در زیر زمین کنند و از چاهی به چاهی آب برند تا آنجا که آب بر روی زمین جاری گردد؛ کهریز؛ قنات)

+ (گڵی: لە گڵ و خۆڵ دروست کراو؛ خاکی؛ لە خاک دروست کراو ف خاکی؛ از جنس خاک و گل)

کە وا بوو **مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە**: کارێز یا کەرێز یا قەناتێکی گڵی یا خاکییە. مەبەست ئەوەیە ئەو کارێزە بەرد و تەلان و ڕەقەن نییە و دیوار و میچ و بانی گڵی و نەرمە.

له نزیک سەقز و لە سەر جادەی سەقز بۆ سنە دێیەکی لێیە بە نێوی کارێزە کە ئەوەندەی نەماوە لە گەڵ شار یەک بگرنەوە و تێکەڵاو بن.
لە سەر خاکی ئێران کەرێزێکی زۆر لە شار و پارێزگاکان هەیە کە دێیەکانیان بە نێوی ئەو کارێزانەوە کردووە. بڕواننە فەرهەنگی دێهخودا کە نزیکەی سەت دێی تێدایە نێویان کەرێز و کارێز و قەناتە. وەک:
- کەرێزەی سەردار لە بۆکان
- کەرێزەی مەحموودئاغا لە بۆکان
- کەرێزەی عەلیئاغا لە بۆکان
- کەرێزە لە سڵدووز (نەغەدە)
- کەرێزە لە شارویرانی مەهاباد
- کەرێزە لە قەراتەوەرەی بیجاڕ



وێنەی ١٢. دێی کەرێزەی گڵی

# کەرەویان

کَرەویان **Kerewian**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ٣٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٥ کەسە.

ئەم وشەیە ئاوێستاییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەرە؛ کارا Kara: خەڵکی چەکدار؛ هێزی بەرگری ف (مردم؛ قشون؛) مردم؛ ارتشی) + (ویان: وشیار؛ عاقڵ؛ تێگەیشتوو؛ عیشق؛ ئەوین؛ میهرەبانی ف عشق؛ دلدادگی؛ هوشیار؛ دانا)[١]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** خەڵکی وشیار؛ خەڵکی وشیار و تێگەیشتووی چەکدار ف مردم ارتشی؛ مردم مسلح هوشیار

لە کتێبی «تاریخ ایران باستان، نووسراوی دیاکۆنۆف» لاپەڕە ٩٧ و ٩٨ لە بابەت "کارە" ئاوا نووسراوە: (لە ڕاستیدا کارا بە خەڵکی ئاسایی دەڵێن کە خەریکی کاروبار و گوزەرانی خۆیانن و چەکداریشن. لە کاتی پێویستدا بۆ شەڕ و بەرگری لە وڵات حازر و ئامادەن. دەتوانین بڵێین ئەوانە هێزی بەرگری بوون.)

لە لاپەڕە ١٨٢ کتێبی «تاریخ ماد؛ مێژووی ماد» لە بابەت کارە یا کەرە ئاوا نووسراوە: (لە کۆتایی سەدەی شەشەمی بەر لە زایین هێشتا سپای ماد لە خەڵک جیا نەبێوە. وشەی کارە کە لە نووسراوە بەردینەکانی بێستووندا کەڵکی لێوەرگیراوە، واتاکەی هەم سپایە و هەم خەڵک. لە ڕواڵەتدا وا دیارە سپایی و چەکدارەکان ئارەزوومەندەکانی (داوطلبان) هۆزەکان بوون.)

---

١ ل ١٣٩٢ کتێبی «فرهنگ واژەهای اوستا» نووسینی ئیحسان بەهرامی

# کووپەقڕان

**Kûpeqiran** **کوپەڨُران**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـانی سـەقز. ٣٩ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٨ کەسە.

**بۆچوونی یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کووپە؛ کوپەک: سەگ؛ سەگی قەڵەو و تووکن|ف|سگ؛ سگ چاق و پرمو) + (قڕان: کوژەر؛ وردکەر؛ شکێنەر|ف|خردکننده؛ شکننده)[1]

**مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** تـۆپینی سـەگ؛ قڕبـوونی سـەگ؛ تـۆپینی بەکۆمەڵی سەگ|ف|مرگ و نابودی سگها؛ تلف شدن جمعی سگها

لە دەوروبەری سـەقز چەنـد نێـو و چەنـد وشـە هەیە کە لەگەڵ وشـەی "قڕان" پێکهاتەیەکی تازەیان بەدیهێناوە. وەک:

ـ تـاوەقڕان: ئـاواییەکی نزیـک دێـی دۆزەخـدەرە لە ڕۆژهەڵاتـی سـەقز. دێیەکی چۆڵکراوە و ماناکەی قڕبوونی خێرا و بەپەلەیە.

ـ گاقڕان: دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ و چۆڵکراوە. مانـاکەی قڕبـوون و تێداچوونی گاوگۆلە.

ـ گـاقڕان: کێـوێکە لە بەینـی ئاواییەکـانی یـازیبلاغی سـەرا؛ ئەحمەدئـاوا؛ سەرکەل و لە ڕۆژهەڵاتی کێوی باڵووقایە هەڵکەوتووە.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

ــ گێچیقــڕان: مەزرایەکە لە نزیــک ئــاوایی قشــڵاقی مەلا. قڕبــوون و مرداربوونەوەی بەکۆمەڵی بزن.

**بۆچوونی دووهەم.** هێندێک کەس ئەم وشەیە بە کوردی دەزانن:

(کـووپە: دەفـرێکە لە سـواڵەت و لە گـڵ دروسـتکراو[ف]ظرفـی گلـین) + (قـڕان: واحیـدی پـووڵ لە سـەردەمی فەتحعەلیشـای قاجـار هەتـا سـەردەمی پەهلەوی. بەرانبەرە لەگەڵ ٢٠ شایی یا ١٠٠ دینار).

**مانـای تێکـڕای وشـەکە دەبێـتە:** کـووپەیەکی پـڕ لە قـڕان[ف]ظرفـی پـر از سکەهای قران

کە من بۆچوونی یەکەمم پێ ڕاستە.

# کەکەوسان

**کەکوسان** **Kekewsan**

دێیەکە سەر بە شاری دیواندەرە. لە دەوروبەری کێوی چلچەمە و ناوچەی خورخورە هەڵکەوتووە. ٣٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٠ کەسە.

ئەم وشەیە ئاوێستایی؛ پەهلەوییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(کەـ کەی: بەو بنەماڵانەیان دەگوت کە هەم کاهین یانی ڕێبەر و بەڕێوەبەری دینی بوون و هەم سەرۆک و حاکمی شەڕکەر[ف] بە خانوادەهایی می‌گفتند کە هم کاهن یعنی رهبر و برگزارکنندەی مراسم دینی بودند و هم حاکم و سردار جنگجو)

ـ کەی بە مانای "شا"یە و ئەم وشەیە لە زمانی سانسکریتدا ماناکەی زانا و عاقڵە.[١]

+ (کاووس: کەیئووس؛ کئەئووس؛ کیاوس: شای بەرز؛ شای سەرکەوتوو[ف] شاه عالی‌مرتبه؛ شاه پیروز

ئەم شایە دووهەمین شای خانەدانی کیانی و نەوەی قوبادە.[٢]

ـ کیکاووس (کیکاوس) فۆرمێکی هەڵەیە کە مێژوونووسانی پاش ئیسلام «کەی»یان دووجار دووپات کردۆتەوە بەڵام ماکەی وشەکە هەر بەو چەشنەی لە دینکرد لاپەڕەی ٩٣ی کتێبەکە و دادستانی دینیک و مینو و خیرەد و هیتردا باسی کراوە «کەیئووس "کیاوس"» ڕاستە.[٣]

---

١ ل ٢٧ کتێبی «تاریخ قبل از میلاد» نووسینی زەڕین‌کووب

٢ ل ٣٠٦ کتێبی «فرهنگ واژەهای اوستا»

٣ ل ٩٣ کتێبی «وهومن یسن» نووسینی سادق هیدایەت

+ (ان: ئەم ئەلف و نوونە، ئەلف و نوونی باوک و فەرزەندیە (ئەبوەت؛ أُبُـوّت) کە لە زمانی پەهلەوی و فارسیدا کەڵکی لیوەرگیراوە و نابێ لەگەڵ ئەلف و نوونی کۆکردنەوە (جمع بستن) لێمان بشێوێ و هەڵە بکەین.[1] لە نووسراوەکانی پەهلەویدا وێنە و نموونە بۆ ئەم «ان»ە زۆرە. وەک:

- خوسرەو قوبادان: خوسرەو کوڕی قوباد ف خسرو پسر قباد
- ئەردشیر بابەکان: ئەردەشیر کوڕی بابەک ف اردشیر پسر بابک
- مەزدەک بامدادان: مەزدەک کوڕی بامداد ف مزدک پسر بامداد
- ویشتاسپان: کوڕی ویشتاسپ ف پسر ویشتاسپ[2]
- کاوسان: کوڕی کاووس ف پسر کاووس[3]

کەوابوو واتای وشەی «کەکەوسان» دەبێتە:

شای کوڕی کەیکاووس؛ شای کوڕی کاووس ف شاه فرزند کاووس؛ کی پسر کیکاووس

بەو بۆچوونە و بەم پێیە هەروەک دەزانین کوڕی کەیکاووس نێوی «سیاوەش» بووە. سیاوەش لە ڕووی ئەو ڕووداوانەی بەسەری هاتووە، زۆر لە باوکی بەنێوبانگترە و نێوی تێکەڵاوی ژیانی هەموو گەلانی ئێران بووە بەتایبەت لە شانامەی فیردەوسیدا زۆر بە خەستی باسی کراوە. بۆ نموونە یەکێک لەو ڕووداوانەی لە سەردەمی شایەتی کاووس بە سەر سیاوەش هاتووە، عیشق و ئەوینی سوودابە بە سیاوەشە. سوودابە کە ژنی کەیکاووس و زڕدایک (باوەژن)ی سیاوەش بوو، عاشقی زڕکوڕەکەی خۆی بوو و بوختانی داوێنپیسی لە سیاوەش دا، بەم هۆیەوە بەر ڕق و تووڕەیی

---

١ ل ٣٢ کتێبی «آرا و عقاید مزدک» نووسینی سەیدعەلی مەهدی نەقەوی
٢ ل ١٤٣ و ١٤٦ کتێبی «زبان پهلوی» نووسینی ژالە ئاموزگار و ئەحمەدی تەفەزولی
٣ سەرچاوەی پێشوو

کەیکـــاووس کەوت. ڕووداوی دووهەم پێکهێنـــانی ژیـــانی هـــاوبەش لەگەڵ فەڕەنگیس کچی ئەفراسیاب بوو کە بە دەست کیسی گەورەپیاوانی لەباری ئەفراسیاب، سیاوەش بە دەست ئەفراسیاب کوژرا. بە ڕیوایەتی فیردەوسی بە ڕژانی خوێنی سیاوەش گیایەک ڕوا (شین بوو) بە نێوی «سیاووشان».[1]

- بیرەوەرییەکانی ماتەمینی سیاوەش و سیاووشان ئێستاش کە ئێستایە لە مێـژوو و دابونەریتەکـانی بـاو لە ئێـران و عێـراق و تورکییـە و قەفقـاز شوێنپێیان دیارە.

- سیاووشان ڕەسم و ئایین و دابونەریتێکی کۆن و هەڵقوڵاوی ئاسیای ناوەنـدی و ئێرانـی گەورەیە و یەکەم وێـنەی، دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەردەمی «بەردی نویێ؛ نو سنگی» و پەرەگرتنی کشتوکاڵ.

ئەم نێوە «کەکەوسان» لە زۆر جێ هەیە بەڵام بە پاش و پێش بوونی پیتەکان. بۆ نموونە:

- کەکەوسان: دێیەکە لە دەوروبەری کوێستانی چلچەمەی دیواندەرە

- کەکاوسان: دێیەکە کانی و سەرچاوەی ئاوی گەرمی هەیە کە بۆ ژان و کۆنەنەخۆشـیەکان بەکەڵـکە. دەڵـێن لە ڕۆژگـاری زۆر کـۆن هەتـا زەمـانی بەختونەسـر و هـاتنی جوولەکەکـان لە شـامەوە بـۆ ئەم وڵاتە، ئیسـفەهانی ڕاستەقینە ئێرە بووە.[2]

- کاکۆسان: دێیەکە سەر بە شاری سەردەشتی ئازەربایجانی ڕۆژئاوایی.

- کۆسان: دێیەکە سەر بە ناوچەی شاهۆی کامیاران. چۆڵکراوە.

---

١ ل ٣٢٦ تا ٣٢٨ کتێبی «شناخت اساطیر ایران» نووسینی هینلز

٢ ل ١١٠ کتێبی سەفەرنامەی «صوره الارض» نووسینی ئیبنیحەوقەل، وەرگێڕانی دوکتور جەعفەر شوجاع

له لاپه‌ڕه ٥٣٥ی کتێبی «خلافت شرقی» نووسینی گای لیسترینج‌دا شیعرێک له‌م بابه‌ته‌وه هه‌یه:

کوسان (کوس):

کجا کز جهان کوس خوانی همی

جز این نیز نامش ندانی همی

له لاپه‌ڕه ١٠٧ کتێبی (اساطیر ایران) نووسینی مێهرداد به‌هار نووسراوه:

راه کاوسان: همان کهکشان است.

واته ڕێگای کاوسان: هه‌ر کاکێشان یا کۆشکه‌ڵانه.

# کەمەرەسیاو

کَمَرَەسْیاو **Kemere syaw**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ... ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی .. کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەمەرە: گاشەبەرد؛ ناوەندی زەمین؛ ناوقەدی هەرشتێ؛ چیای شاخ؛ کوچکەبەرد؛ کەمبەرەی خشڵ ف سنگ بزرگ؛ میانەی زمین؛ میان هرچیزی؛ کوه تمام سنگی؛ قلوەسنگ) + (سیاو: دژی سپی؛ ڕەش ف سیاە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کێوەڕەش؛ بەردەڕەش؛ کوچکەڕەش ف سیاەکوە؛ سیاەسنگ

لە وشەی «سیاو» یا «سیا» کە مانای هەردووکیان ڕەشە لە زۆر جێ و بۆ نێونانی زۆر ئاوایی کەڵک وەرگیراوە. وەک:

ـ کاکەسیاو: کاکەڕەش ف داداش‌سیاە. دێیەکە لە ناوچەی ساحێب

ـ سیاوی: ڕەشی ف سیاهی. مەزرایەکە لە ئاوایی باشماغ

ــ سیانزار: شاخەڕەش؛ کێوەڕەش ف سیاەکوە. دێیەکە لە ناوچەی زولفەقاری سەرشیو.

ــ سیادەرەی سەروو: دۆڵ و دەرەی ڕەش ف سیاەدرە. ئاوایییەکە لە ناوچەی میرەدێ

ــ سیادەرەی خواروو: دۆڵەڕەش ف سیاەدرە. ئاوایییەکە لە ناوچەی میرەدێ

ــ سیاوڵە: ڕەشکە؛ دەنکی وردی ڕەش کە بە کولێرەوەی دەکەن. مەزرایەکە لە ئاوایی بارام.

# کۆندەڵان

**کُنْدَلان** **kondelan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ٩٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥١٧ کەسە.

بۆچوونی **یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کۆندە؛ کوندە: دەفری زەلام لە چەرم بۆ ئاوکێشان؛ کوندک ف مشک آبکشی) + (ڵان: جێگە؛ شوێن؛ جێ ف محل؛ مکان؛ جا؛ لان در پارسی معنی ظرف و جای است)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** جێگای دانانی کوندەی ئاو ف سردابەی جای مشک آب

بۆچوونی **دووهەم.** هەندێ کەس پێیانوایە ئەم وشەیە کەندەڵانە کە ماناکەی دەبێتە: ئاودڕ؛ لێواری قووڵکەی زۆر فراوان و گوشاد ف کنارەی آبکند گشاد؛ آبکند.

دێیەکی دیکە هەیە بە نێوی «کەندۆڵان» کە سەر بە ناوچەی «ئیمام»ە لە سەقز.

(کەندۆ: پارێن، پانێر ـ کۆندۆ مانگایەکی ئاوس نەبووە و شیر دەدا. ف گوساله دو ساله ـ گاو آبستن نشده شیردە)

واتاکەی شوێنی پارێن ف محل و مکان گوساله دوساله

من پێم وایە هەم «کوندەڵان ـ کندلان» و هەم «کەندۆڵان ـ کندولان» ماناکەیان یەکە و ئەویش کەندەڵان و ئاودڕە ف معنی هر دو آبکند است.

# کانی‌کەوە

**کانی‌کبود** **kanîkewe**

ئەم دێیە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقزە. ١ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کانی: چاوە؛ چەشمە؛ هانی؛ خانی؛ چاوەی ئاو ف چشمە) + (کەوە: کەوو؛ کەوگ؛ شینی کاڵ؛ ئاوی کەمڕەنگ ف کبود؛ آبی روشن؛ نیلی رنگ)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی ئاوی‌ڕەنگ؛ چاوەی شین ف چشمەی آبی رنگ؛ چشمە کبود

لە زۆر جێ لە وشەی "کەوە" بۆ نێوی ئاوایی و شتی دیکە کەڵک وەرگیراوە. وەک:

کێلەکەوە: (کێل: بەردی قەبر؛ پێوانەی دانەوێڵە؛ جۆری کولێرە؛ تەگە ف سنگ مزار؛ پەیمانەی غلە و...) + (کەوە: کەوو؛ شینی کاڵ؛ ئاوی کەمڕەنگ ف کبود؛ آبی روشن)

مانای وشەکە دەبێتە: بەردی قەبری شین، ئاوی‌ڕەنگ؛ بەردی کەوو ف سنگ مزار آبی روشن

لە دێی بارامیش مەزرایەکی لێیە بە نێوی: بەردەکەوە ف سنگ آبی

# کەسنەزان

**کَس‌نَزان** **kesnezan**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ١٢٢ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٩٨ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەس: تاکێ لە بنیئادەم[ف]کس؛ شـخص) + (نەزان: بێئاوەز؛ بێعەقڵ[ف] نادان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو دێیە کەس پێی نازانێ؛ ئەو ئاواییە لە پەنا و پەسیوێکی وا هەڵکەوتووە کەس جێگەکەی نازانێ[ف]کسی مکان و محل این روستا را نمی‌داند؛ مکان آن برای همه ناشناخته است.

# کانی‌نیاز

**کانی‌نیاز** **Kanî niaz**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٤٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢١٠ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کانی: چاوە؛ هانی؛ حانە[ف] چشمە) + (نیاز: ئیحتیاج؛ ئاتاجی؛ ئاوات؛ ئارەزوو[ف] احتیاج؛ آرزو)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی و چاوەیەکی نیازی خەڵک بەجێ‌دێنێ؛ کانیەکی دەچنە سەری، ڕازونیازی خۆیانی پێ دەڵێن؛ کانی مراد[ف] چشمه‌ای که نیازگشاست؛ چشمه‌ای که نیاز نیازمندان را برآورده می‌کند.



وێنەی ١٣- دێی کانی‌نیاز

# کانی‌جه‌ژنی

**کانی جَشْنی** **Kanî cejnî**

ئاواییه‌که سه‌ر به ناوچه‌ی سه‌را. ٣٤ ماڵه و ژماره‌ی دانیشتووانی ١٦٩ که‌سه.

ئه‌م وشه‌یه کوردییه له سێ به‌ش پێکهاتووه:

(کانی: چاوه؛ هانی؛ حانه‌[ف]چشمه) + (جه‌ژن: جێژن؛ جه‌ژنه؛ ڕۆژی خۆشی[ف]عید؛ جشن) + (ی: یای پێوه‌ند[ف]یاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشه‌که ده‌بێته:** ١ـ ئه‌و کانیه‌ی جێژنانه ده‌چنه سه‌ری و خۆشی ده‌که‌ن ٢ـ یا ئه‌و کانیه‌ی ئه‌وه‌نده ئاوی زۆره هه‌میشه وه‌ک جێژنی بێ وایه.

# کێلەشین

**kêleşîn** **کیلَشین**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ١٠٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥١٧ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(کێل: بڵند، بەرز؛ بەردی سەرین و پاینی گۆڕ ف بلند؛ سنگ مزار) + (ە: های ناسێنەر ف های معرفه) + (شین: کەوە، کەوو، کەوگ؛ بە ڕەنگی ئاسمانی؛ ڕەنگی گیا؛ سەوزی تۆخ ف رنگ آبی سیر؛ سبز سیر)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** بەردی قەبری کەوە؛ بەردی قەبری شین و ئاوی ف سنگ مزار آبی؛ سنگ قبر سبز سیر

* لە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان نزیک دێی سەیداوا، دێیەکی لێ بوو بە نێوی «کێلەکەوە= کێلەشین» کە کەوتۆتە ژێر ئاوی سەدی بۆکان.

# کەندەسوورە

**کنده سووره** **Kende sure**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٥٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٧٩ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کەند: قووڵکە؛ ئاودڕ ف چالە؛ آبکند) + (ە: پیتێکە بۆ ناساندن بە کار دەهێنرێ ف حرف معرفه) + (سوور: بە ڕەنگی خوێن ف سرخ، قرمز) + (ە: پیتی ناسێنەر ف حرف معرفه)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو کەندەڵانەی سوورە؛ کەنەڵانەسوور؛ مەبەست ئەوەیە ئەو کەندە، سوورە گڵە ف آبکند سرخ؛ آبکند با خاک سرخ.

# کانیبەن

**کانیبند** **Kanîben**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٢٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣١ کەسە.

**بۆچوونی یەکەم.** ئەم نێوە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کانی: چاوە؛ هانی؛ حانە ف چشمە) + (بەن: بان؛ سەروو)

**واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانیبان؛ کانیسەروو چشمەی بالایی.

زۆر ئاوایی دیکەش هەن کە سەرەتاکەیان بە «کانی» دەستپێدەکا. وەک:

- کانی سوور (کانی سرخ): سەر بە ناوچەی تیلەکۆ
- کانی سەیدشوکرە (کانی سیدشکرە): سەر بە ناوچەی تیلەکۆ
- کانی سەید (کانی سید): سەر بە ناوچەی خوڕخوڕە
- کانی چەرمووخواری (کانی سفید سفلی): سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان

**بۆچوونی دووهەم:** ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کانی: چاوە؛ هانی چشمە) + (بەن: ١ـ کەژ، کێو، شاخ ٢ـ دەوروبەری ئاوایی ٣. دار قەزوان[١] ف ١. کوە ٢. اطراف روستا ٣. درخت بنە)

کە وا بوو **مانای سەرجەمی وشەی کانیبەن دەبێتە:** ١ـ ئەو کانیەی لە کەژ و بەندەنی دەوروبەری دێ سەرچاوە دەگرێ ف چشمەای کە از کوەهای اطراف آبادی سرچشمە میگیرد. ٢. کانییەکی دارە بەن یا داری قەزوانی لێیە ف چشمەای با درختان بنە

---

١ ل ١٦٣، کتێبی «زاراوەسازی پێوانە»، مەسعوود محەمەد

# کوێرەگوێز

**کویرەگویز** **Kwêre gwez**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ٣٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠٢ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(کوێر: کۆر، کۆرە؛ بێچاو، نابینا؛ پووک، پووچفکور، نابینا؛ پوک، پوچ) + (ە: هـای ناسـێنەرفهـای معـرفە) + (گـوێز: گردەکـان، قـۆز، وزفجـوز، گردکان، گردو)

**مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** گـوێزی پـووچ، گـوێزی پـووکفگـردوی پوک

# کیسەڵان

**کیسَلان** **Kîselan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٣٠ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣١ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کیسەڵ: ڕەقەف لاکپشت) + (ڵان: جێ، شوێنف مکان، محل، پسوند مکان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێگای کیسەڵ، شوێنێکی کیسەڵی زۆر لێیەف مکان و محل لاکپشتها، جایی کە لاکپشت، زیاد دارد.

# کولتەپە

**کُلتَپە** **Kultepe**

دێیەکە ناوەندی ناوچەی کولتەپەی جانگیرخانە. ٢١٤ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٠١١ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە لە دوو بەش ساز کراوە:

(کول: خۆڵەمێش، خۆڵەکەوەفخاکستر، کود) + (تەپە: کۆگای گەورەی خۆڵ و خاک، تەپۆڵک، گردفتودە، کپە، رأس)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** گردی خۆڵ، تەپۆڵکی خۆڵەمێشفتپە و تودەی خاکستر، تلی از خاکستر)

لە ڕاستیشدا لە نێوەڕاستی ئەو دێیە گردێکی گەورەی خۆڵەمێشی لێیە کە بە دەستکردە و توربەڕێژە و مێژووی ئەو تەپۆڵکانە دەگەڕێتەوە بۆ زۆر لەوەپێش. لە ناوچەدا لە چەند جێ لەو تەپۆڵکە توبرەڕێژانەی لێیە. وەک: کولتەپەی بۆکان؛ کولتەپەی قورمیشی بۆکان

# کووچەتەڵا

**کوچه طلا** **Kûçetela**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٤٧ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٢٢٩ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(کـووچ: خـڕکەبەردفقلوەسـنگ) + (ە: پیتـی ناسـێنەرفحـرف معـرفه) + (تەڵا: زێڕفطلا)

**مانـای تێکـڕای وشـەکە دەبێـتە:** ئەو ئـاواییەی بەردی تەڵای لێـیە؛ ئەو دێیەی بەردەکانی زێڕە؛ بەردە زێڕ؛ بەردی زێڕینەفسـنگ طـلا؛ آبـادی کە دارای سنگ طلاست.

هێندێک پێیانوایە "کووچە" بە مانای کۆڵانە کە ئەوە هەڵەیە.

# کوردکەند

**کُردکَند** **Kurdkend**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـان. ٥٨ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٢٩٢ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کورد: گەلی کورد[ف]کرد؛ نژاد کرد) + (کەند: دێ، گوند، ئاوایی[ف]روستا، آبادی، ده)

**مانای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** دێی کوردان، ئاوایی کوردنشین[ف]آبادی کردها، ده کردها

ـ دێیەک لە بناری سەهەند هەیە بە نێوی: کوردەدێ

ـ دێیەک لە نێوان بوستاناوا و سـەراوی ئـا. ڕۆژهەڵاتـی هەیە بە نێوی کوردکەندی.

# کانی ئاشوور

**کانی آشور** **Kanî Aşûr**

کانی یا چاوەی ئاوێکە نزیک ئاوایی بەدرئاباد و لە ٥٠٠ میتری شمالی ئەو دێیە هەڵکەوتووە.

ئەم نێوە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کانی: چاوە؛ هانی؛ حانە[ف] چشمە) + (ئاشوور: ئاسۆر، نژادی ئاشووری، لقێکن لە زمانی سامی[ف] آسوری، آشوری)

مانای وشەکە: چاوە یا کانیەکی بە نێوی ئاشووریەکانەوە کرابێ.

بە بۆچوونی من ئەو نێوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی هەشت و حەوتی پێش زایین کە ئیمپراتۆری ئاشوور زۆر بەهێز و دەسەڵات بوو و بۆ ماوەیەکی زۆر ئەم ناوچەیە لە گۆلی ورمێوە هەتا چۆمی سیروان لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەواندا بووە. بەم بۆنەیەوە زۆر شوێن و جێگا و ئاوایی و شتی وایان بە نێوی ئاشوورەوە کردووە یا لە وشەگەلی ئاشووری کەڵک وەرگیراوە. بۆ وێنە:

- ئیلانی کە وشەیەکی ئاشووریە یانی «خودایان» دێیەکە لە بۆکان
- ئیلوو وشەیەکی ئاشووریە یانی «یەزدان، خودا» ئاواییەکە لە سەقز.

# کانامەت

**کانعمت** **Kanamet**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی چـلچەمەی سەرشـیوی سـەقز. ٤٢ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٤٧ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ماکەی نێوی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم نێوە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(کا: کاک، برای گەورە، وشەی حورمەت بۆ پیاوان ف برادر بزرگتر، کلمه احترام برای مردان) + (نامەت: سووکەڵە نێوی «نیعمەت»، نێوی پیاوانە ف ساده شده نعمت، نامی برای مردان)

**مانای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** کاک نیعمەت. وا دیارە یەکەم جار ئەو پیاوە ئـاوایی کانـامەتی ئاوەدان کردۆتەوە. یا دەکرێ بڵێین ئەو دێیەیان بە نێوی ئەو پیاوەوە کردووە. ف کـاک نعمت. گمـان مـی‌رود بـرای اولـین بـار شخصی به نام کاک نعمت روستا را آباد کرده باشد یا به هر دلیل روستای مذکور را به نام ایشان کرده باشند.

لە باس و شرۆڤەی چەند ئاوایی وەک ئیسحاقاوا، مەولاناوا، خۆشێنان و... ئاماژەمـان بەوە کـرد کە ئەم نێـوانە لە پێوەنـدی لەگەڵ ئـایینی یارسـان «ئەهلی هەق ـ کاکەیی» نێو نراون. لێرەشدا پێم وایە ئەو «نیعمەت»ە پیاوێکە سـەر بە یارسـانیەکان کە دانەری نـامیلکەی «فرقـان الاخبـار»ە و خەڵکـی جەیحوونئابادی نزیک دینەوەری کرماشان (١٩٢٠-١٨٧١ی زایینی) و لە لقی «خامۆشـی» بـووە. ئەم نـیعمەتە پێـی وا بـووە کـاتی ئاشـکرا کردنـی «حەقیقەت» هاتووە.[١]

---

١ ل ٢١٤ و ٢١٩ کتێبی مینۆرێسکی و کورد. مینۆرێسکی، وەرگێر ئەنوەر سوڵتانی

لێرەدا دەبینین ئەم نێوە بە فۆرمی «کاـ نامەت» یا «کاـ نیعمەت» دەخوێندرێتەوە کە لە چەشنی هێندێک نێوی سەر بە یارسانیەکان و جێگرانی سوڵتان سەهاکە. وەک: کاکا ڕەحمان، کاکا میرە، کا مەریجان.

کەوابوو بۆچوونی من ئەوەیە کە ئەم دێیە بە نێوی «کانامەت» کراوە کە پیاوێکی نێوبەدەرەوەی کاکاییەکان بووە.

**دووەم.** وشەکە کوردییە و دوو بەشە:

(کا: کاک، برای گەورە، وشەی حورمەت بۆ پیاوان ف برادر بزرگتر، کلمە احترام برای مردان) + (نامەت: سواوی نەدامەت، نەگبەت، بەڵا، بەدبەخت، چارەڕەش ف ندامت، سیەروز، نکبت، بیچارە)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کابرای بەدبەخت و ڕۆژڕەش و نەگبەت ف فرد سیاەچارە، نکبت، سیەروز

وا دیارە ئەو کەسەی ئەو دێیەی ئاوەدان کردۆتەوە، خەڵک بە نەگبەت و چارەڕەشیان زانیوە چونکە شوێنێکی دوور و پەرت و پەڕی ئاوەدان کردۆتەوە و نێوی دێیەکەش هەر بە نێوی ئەو پیاوە کراوە. ف ظاهرا به خاطر آنکه این شخص این مکان پرت و دور افتاده را آباد کرده و در آن زندگی می‌کرده است به بدبخت و نکبت و سیاەچاره موسوم بوده و اسم ده را هم به نام ایشان کرده‌اند.

# گردیگلان

**گردیگلان** **Girdîglan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی تورجان. ٨١ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٤٢٠ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(گرد: تەپە، تەپۆڵکە⃞ف تپە) + (ی: یای نیسبەت⃞ف یاء نسبت) + (گلان: خلۆر بوونەوە، گلار بوونەوە، بە سەر ڕوودا کەوتن «ئەسپەکەم گلا»، پەرت بوون «لە ئەسپەکەم گلام»⃞ف تلو تلو خوردن، غلت زدن، سکندری خوردن، پرت شدن، غلتیدن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو تەپەیەی کەسێکی لێ گلاوە (مەبەست کوژرانی کەسێک بە سەر ئەسپەوەیە؛ تەپۆڵکەیەکی کەسێکی لێ بەربۆتەوە و بە ڕوودا کەوتووە⃞ف تپەای کە کسی در آن افتادە و در آن غلتیدە (کنایە از کشتە شدن)

ئەم چەشنە نێوە زۆرە و لەسەر زۆر ئاوایی داندراوە:[1]

- گردی کاوڵان: دێیەکە لە بەر بنەی لاجان
- گردی گەڕۆڵ: نێوی گەڕەکێکە لە شاری سنە
- گردە گرِوێ: دێیەکە لە شارویرانی مهاباد
- گردەقیت: دێیەکە لە ناوچەی سندووس
- گردی قەبران: دێیەکە لە بۆکان

**دووهەم.** بۆچوونی دیکەش هەیە. بۆ وێنە:

گردی گوڵان: تەپەی گوڵ و گوڵزار، تەپۆڵکەیەکی پڕ لە گوڵ بێ⃞ف تپەی گل‌ها

بەڵام بۆچوونی یەکەم ڕاستە.

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# گاوەشەلە

**گاوشلە** **Gaweşele**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٣٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٨٦ کەسە.

**بۆچوونی یەکەم:** ئەم وشەیە کوردیە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(گاو= کاو: چیای بەرین؛ شاخ و کێو؛ زەردومای ساف و سەختف کوە سنگی؛ کوهستان سنگی و سخت) + (ە: هـای ناسێنەرف هـای معرفە و شناسە) + (شەلە: ئەم وشەیە لە ڕاستیدا «وەشڵە[1]: جوانکەڵە، خۆشی»یە کە «و»ی گاو لەگەڵ «و»ی وەشڵە تێکەڵاو بووە.)

**سەرجەمی مانای وشەکە دەبێتە:** چیای بەردینی جوان و ڕازاوەف کوهستان صاف و سخت زیبا.

من پێموایە وشەی «کاو، گاو» لە زمان و فەرهەنگی خەڵکی ئەم ناوچەیەدا باو بووە و لە زۆر جێ کەڵکی لێوەرگیراوە، وەک: «گاوەکەچ»ی سەروو و خواروو؛ کاوەملە و چەند نێوی دیکە.

**بۆچوونی دووهەم.** ئەم وشەیە کوردیە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(گاو: مانگا؛ چێلف گاو) + (ە: هـای ناسێنەرف هـای معرفە و شناسە) + (شەلە: شەل؛ لەپێ سەقەتف گاوی کە میلنگد، گاو لنگ)

**مانای وشەکە دەبێتە:** مانگاشەلەف گاوی کە میلنگد، گاو شل، گاو لنگ

هەر بەم نێوە ئاواییەکیش لە شاری تیکاب (تیکانتەپەی هەوشار) هەیە.

لام وایە مەبەست لەم نێونانە ئەوە بووبێ کە بڵێن ئەم دێیە سەخت و قاقڕە و هەر مانگاشەلێک دێنێ.

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# گاوەکەج

**گاوَکَچ** **Gawe keç**

دوو ئاوایی سەر بە ناوچەی خورخورەی شاری سەقزن:

١ـ گاوەکەچی سەروو. ٢٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٣٦ کەسە.

٢ـ گاوەکەچی خواروو. ١٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٦ کەسە.

**بۆچوونی یەکەم:**

خوسرەو پەرویز (خوسرەوی دووهەم) شای ساسانی (٦٢٨-٥٩٠ز) لە ماوەی ٣٨ ساڵ حوکمی خۆی بێجگە لە شەڕ و شۆڕ و سەرکەوتن و تێکشکان، زۆر شتی بوو کە سەرنجی جەماوەری ناوخۆ و دەرەوەی ڕاکێشابوو. ئەو شتە سەرنجڕاکێشانە ببوونە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری مێژوونووسانی ئێرانی و عەرەب. بەلعەمی و سەعالبی باسی دوازدە شتی سەیری خوسرەوپەرویزیان کردووە. وەک: کۆشکی تیسفوون، ئاڵای کاویان، شیرینی ژنی، گۆرانیبێژانی وەک باربود، سەرکەش، نەکسیا، ئەسپی شەودیز، فیلی سپی و گەنجەکانی.

لە نێوان ئەو گەنجانە کە حەوت گەنج بوون و فیردەوسیش لە شانامەدا باسیان دەکا، دوو گەنجیان زۆر بەناوبانگن: ١ـ گەنجی "بادآورد": ئەو گەنجەی با هێناویە ٢ـ "گنج گاو" "گاوگنج": گەنجی گا.

سەعالبی، مێژوونووسی عەرەب، ئاوا باسی "گنجگاو" (گاوگەنج) دەکا:

(وەرزێرێک بە جووتێک گا خەریکی جووت بوو و شێوی دەبڕی. لەپڕدا نووکی گاسنەکە لە کووپەڵەیەک پڕ لە سکەی زێڕ دەگیرێ. وەرزێڕەکە چۆتە بارەگای شا و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوەتەوە. شا فەرمانی دا ئەو زەویانە بکێڵن و سەر و ژێریان کەن. ئەو شتانەی لەو زەویەدا شاردرابوونەوە، دۆزرانەوە و دەریانهێنان. سەت کووپەڵەی پڕ لە زێڕ و زیو و گەوهەریان هێنا دەرێ کە مۆری ئەسکەندەریان پێوەبوو و لە گەنجەکانی ئەو بوون. کاتێک خوسرەو چاوی بەو گەنجانە کەوت، سپاسی خودای کرد و یەکێ لە کووپەڵە دۆزراوەکانی دا بە کابرای وەرزێڕ و ئەوانی دیکەی لە شوێنێک دانا کە پێیان دەگوت "گنجگاو" یا "گاوگنج"[1]. ئەو گەنجانەی خوسرەو ئەوەندە گەورە و بەنێوبانگ بوون، وەک نیشانەی هێز و گەورەیی شا باسیان دەکرد. تەنانەت گۆرانیبێژانی بەناوبانگی بارەگای شا وەک نەکیسا و باربود گۆرانییان بە سەردا هەڵکوتووە و دەستان و یا ئاهەنگێکی تایبەتی بە ناوی دەستانی (گاو گنج؛ گنجگاو) هەیە.[2]

بە ڕای من ئەم دوو ئاواییە بە ناوی ئەو گەنجەوە کراوە. ئەو نێوە لە سەردەمی ساسانیانەوە (ساڵی مەرگی خوسرەوپەرویز ٦٢٨ زایینی) هەتا ئێستا کە نزیکی ١٣٨٣ ساڵی بە سەردا تێپەڕیوە، ئاڵوگۆڕێکی زۆر کەمی بە سەر هاتووە و پیتی «ن»ی گەنج بۆ هاسانی لە وتووێژدا لابردراوە و وشەی گەنج بووە بە کەج.

بەڵام پرسیار ئەوەیە بۆچی ناوی ئەو گەنجەیان لەسەر ئەو دوو ئاواییە داناوە؟

---

١ ل ٤٧٨ کتێبی «ایران در زمان ساسانیان» نووسراوی ئارتور کریستیان سێن، وەرگێڕ ڕەشید یاسەمی

٢ ل ٤٩٨، سەرچاوەی پێشوو.

دەبێ بڵێین خوسرەوپەرویز زۆر جار بۆ زیارەتی ئاورگەی تبارمائیس (شیز یا تەختی سولێمانی ئێستا) و شەڕ لەگەڵ بارامی چووبین گەورەسەرداری سپای ئێران و شەڕ لەگەڵ هێراکلیۆس ئیمپراتۆری بیزانس هاتۆتە ئەم وڵاتە و پێیدا تێپەڕیوە و بە چاوی خۆی دیتوویەتی کە ئەم مەڵبەندە چەندە چڕ و پڕ و سەخت و هەڵەمووتە و بۆ پاراستن و قایم ڕاگرتن و شاردنەوە شوێنێکی باشە. بەشێک لە گەنجەکانی خۆی «گاوگەنج»ی لێرە داناوە و نیگابان و پارێزەری بۆ دابین کردوە و لە ئەنجامدا ئەم دوو شوێنە بوون بە ئاوایی و ناویان بە گاوگەنج دەرکردووە.

بۆچوونێکی دیکەش هەیە. ئەو شوێنە دارستان و گژ و گیا و لێڕەوارێکی زۆر چڕ و بەپیت و بەرەکەتی بووە بۆ ئاژەڵداری و لەم ڕووەوە شوێنێکی بێوێنە بووە و ناوی گەنجی خوسرەوپەرویزیان لە سەر داناوە و لە ڕاستیدا بەو گەنجەیان شوبهاندووە.

کەوابوو وشەی گاوگەنج (گاوەکەج) کە وشەیەکی کوردی؛ فارسییە لە سێ بەش پێکهاتووە:

(گاو: گا) + (ە: پیتی ناسێنەر[ف] حرف معرفه) + (کەچ: گەنج[ف] گنج)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** گەنجی گا یانی گەنجێکی کە بە هۆی گا دۆزراوەتەوە[ف] گنجی کە توسط گاو یافتە شدە است.

بۆچوونی دووهەم. وشەی گاوەکەچ کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(گاو: کاو، چیای بەردین، شاخ و کێو، زەرد و مای ساف و سەخت، کوێستانی بە بەردی ساف و سەخت و گاشەبەرد کە گیای لێ ناڕوێ[ف] کوە سنگی؛ کوهستان با صخرەهای صاف و عظیم) + (ە: های ناسێنەر[ف] های شناسە، های معرفە) + (کەچ: گێج؛ پێچ؛ چەوت؛ لار؛ خوار؛ نسرم؛ نسار؛

بەرسێبەر؛ شوێنێکی خۆر نایگرێ[١] ف کج؛ پیچ؛ جای همیشه سایه؛ سایەگیر و سرد؛ برخلاف آفتابگیر)

کەوابوو **واتای گاوەکەچ دەبێتە:** شاخ و کێوی سارد و سەخت؛ چیای نسار و نسرم و لاڕێ ف کوهستان سرد و سایەگیر پر برف.

بە هۆی ئەوەی ئاوایییەکانی گاوەکەچی سەروو و خواروو لە نزیک کێوی بەرز و سەرکەشی «سەرتەزێن» کە ٢٦٩٥ میتر بڵیندایی هەیە هەڵکەوتوون و تەنانەت لە شانی شیمالی ئەو کێوەن کە خۆرەتاو نایانگرێ و تا درەنگانێ لە ساڵ بەفر ناچێتەوە، ئەو نێوە (پڕ بە پێستەیان) لێناوە. من بەش بە حاڵی خۆم ئەم بۆچوونەم پێ ڕاستە.

بڕواننە ئەو هۆنراوانەی شاعیری پایەبەرز مەولەوی تاوەگۆزی:

گێج سەرکاوان جە سەردی بین کەیل
بۆ مەدان چون بۆی بێوەفایی لەیل

واتە: پێچ و لۆفەی شاخەکان پڕ بوون لە سەرما و بۆنی سەرمایان لێدێت وەک بۆنی بێوەفایی یار.

دڵ وە «گێجبازی» چەپگەرد بازیش وەرد
جفت ئارەزوو کەرد، چەپگەرد تاق ئاوەرد

واتە: دڵم بە تاقمانەجووتی گەردوون هەڵخەڵەتا. ئەم دوانی ئەویست، کەچی ئەو یەکی هێنا.[٢] لە هێندێ نوسخەدا لە جیاتی «گێجبازی» نووسراوە «کەچبازی» یانی کاری چەوت و لار و لەوێری گەردوون.

---

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

٢ دیوانی مەولەوی تاوەگۆزی، ل ١٨٠ و ٦٦، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

# لەگزی

لَگْزی **Legzî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. ٨٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٦٧ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە نێوی پیاوانی مەغوولی بووە.[١] وەک:

١ـ زاوای هۆلاکۆ، مێردی یەکێ لە کچەکانی بە نێوی «بابا». نێوی لەکزی گوورەکان بووە.

٢. نێوی یەکێک لە سەردارانی سپای ئەحمەد تێگۆداری کوڕی هۆلاکۆ، لەکزی بووە.

**دووهەم.** ئەم وشەیە نێوی شوێن و ئاوایی بووە. وەک:

هۆلاکۆ فەرمانی بە شێخ شەریفی تەورێزی دا بە جاسووسی لە ڕێگای لەکزستانەوە بچێ و بوقای بگرێ و بیهێنێ.[٢]

* ئاواییەک بە نێوی «لەگز» لە نزیک دێی مەڵلالەری بۆکان هەیە.

---

١ لاپەڕە ٦٨٤ و ٧٣٣ و ٧٩٥ کتێبی «جامع التواريخ» نووسینی ڕەشیدەدینی فەزلوڵڵا

٢ سەرچاوەی پێشوو

# ماسیەر

**ماهیدَر** **Masier**

لە ناوچەی خورخورەی سەقز دوو دێ بە نێوی ماسیەر هەیە:

١. ماسیەری سەروو (ماسیەری شێخ). ١١٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧٠٣ کەسە.

٢. ماسیەری خواروو (ماهیدر سفلی)، ٥٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٦١ کەسە.

وشەی ماسیەر کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(ماسی: یەکێک لەو گیاندارانەی لە ئاودا دەژی و گۆشتی دەخورێ ف ماهی) + (یەر: دەر؛ شوێن و جێی شتێک ف در؛ محل و مکان چیزی)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێک ماسی لێبێ ف محلی کە ماهی دارد.

وشەی وەک ماسیەر کە پاشکۆ یا پەسوەندەکەی "یەر"ە زۆرە. بۆ وێنە:

ـ ئاویەر: یانی شوێنێک ئاوی پێدا دەڕوا؛ یا شوێنێکە ئاوی لێیە وەک کێوی بەنێوباگی ئاویەری سنە کە بە بۆنەی ئەو کانی و ئاوانەی وایان نێوناوە.

ـ باییەر (بایدر): یانی شوێنێک بای زۆرە و باگرە. دوو دێی سەرشیوی سەقز نێویان باییەرە.

ـ له ناوچەی موکریان له جیاتی وشەی ئاویەر له وشەی "دەراو" کەڵک وەردەگیرێ. بۆ نموونه دەڵێن: من به دەراوی خوارێدا دەپەڕێمەوە. یا دەراوی زەمبیل هاوینان ویشکه.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیه و هۆی نێونانی دوو دێی ماسیەر، دوو بۆچوون هەیه:

**یەکەم.** ئەو دوو دێیه له سەر چۆمی جەغەتوو «زەرینه؛ زرینه) هەڵکەوتوون و چونکه ئەو چەمه ماسی زۆر تێدابووە نێوی ماسیەریان لەسەر ئەو دێیانەی نزیک چۆمەکه داناوە. دەبێ ئەوە بزانین له سەدەکانی ٨ و ٧ی پێش زایین نێوی ناوچەی خوڕخوڕە (مەسی؛ ماسی؛ مەسۆ) بووە. له زۆر کتێب و نووسراوەدا ئاماژە به نێوی «مەسی» کراوە بەڵام ئەوانەی نێوی دەبەن یا ئاماژەی پێدەکەن نازانن مەسی کوێیه یا وای دوور دەخەنەوە که فڕی به سەر ڕاستیەوە نییه. بۆ ئەوەی هەمووان بزانن مەسی ناوچەی خوڕخوڕەی ئێستایه دەبێ ئاماژە بەوە بکەین له نزیک دێی سوننەته که له نزیک چۆمی جەغەتوو هەڵکەوتووە، ڕاست لەو پێچانەی نزیک دێ، شوێنێکی لێیه به نێوی «مزیوەرە، مسیوەرە، مسیوَر» که ئەم وشەیه له دوو بەش پێکهاتووە:

(مزی؛ مسی: گەورە، مەزن؛ پان، بەربڵاو ف پهن، پهناور؛ بزرگ، سترگ) + (وەرە: بارە، قەڵا، دژ ف بارە، دژ، قلعه، بارو)[1]

**واتای وشەکه دەبێته:** قەڵای گەورە ف باروی بزرگ

ئەم وشەیه نیشانەی ئەوەیه ئەو ناوچەیه نێوی مسی یا مزی بووە که به بڕوای من ماناکەی گەورە یا مەزنه. کەوابوو ناوچەی خوڕخوڕە له

---

١ ل ١١٠٧ و ١١٠٩ کتێبی «فرهنگ واژەهای اوستا»

سەدەكانی پێش زایین نێوی «گەورە یا مەزن» بووە و ناگەڕێتەوە بۆ وشەی ماسی یا ماهی.

بۆچوونی **دووهەم**. لە زمانی فارسی كۆندا بە وشەی «ماد» گوتراوە «ماسی» بۆ وێنە: لە كتێبی كارنامەی ئەردەشیری بابەكان لاپەڕەی ١٧٩ باسی شەڕی ئەردەشیر لەگەڵ كوردەكان كراوە و وڵاتی كوردان بە "ماسی" نێو براوە. بڕوانە:

(پس از آن بسیاری سپاه گُند زابل بهم فراهم کرده به کارزار کُردان‌شاه ماسی فرنفت)

واتا كوردییەكەی: پاش ئەوە، سپا و سەربازێكی زۆری كۆ كردەوە و چووە شەڕی كوردانشای ماسی.

بە پێی ئەم بۆچوونە دەتوانین بڵێین ماسیەر ناوچە یا ئاوایی مادەكان بووە.

بە بڕوای من ئەم بۆچوونە لە بۆچوونی یەكەم لاوازترە چونكە بەر لەوەی مادەكان بێنە ئەم ناوچەیە و دەسەڵات بە دەستەوە بگرن (لە ساڵانی ٦١٦-٦١٥ی پێش زایین) و هەوەخشەتەرە، «ئۆئاڵی» دوایین شایماننا لە دەسەڵات بخا و كۆتایی بە حكوومەتی ماننا بێنێ، ئەم ناوچەیە هەر نێوی مسی یا مسۆ بووە. بۆ نموونە لە هەواڵی هێرشی ئاشووریەكان بۆ سەر ماننا ئاوا نووسراوە: لە ساڵی ٧١٤ی بەر لە زایین سارگۆنی دووهەم هێرشی كردە سەر ماننا. سەرەتا چووە نێو وڵاتی «سوری گاش» و دواتر سارگون بۆ شوێنەگومكێ چووە وڵاتی ژێر دەسەڵاتی شای ئالاباری و لەوێشەوە چووە نێو وڵاتی ئاشووری پارسوا. شای ئاشوور لە پارسواوە دەستی كرد بە جموجۆڵ و لە كەژ و كێوی ناوچەكە تێپەڕی و هاتە نێو سەرزەمینی «مسۆ» كە یەكێ لە ناوچەكانی ماننا بوو.[١]

---

١ ل ٢٠١ كتێبی «تاریخ ماد» نووسینی دیاكۆنۆف

# مۆکه

**موکَه** **Moke**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرای سەقز. ١٦ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٧١ کەسە.

مۆکە وشەیەکی مەغوولییە و نێوی ژن و پیاوی مەغوولە. وەک:

١ـ چەنگیزخان ژنێکی بوو لە هۆزی «بەکرین یا موکرین» کە زۆری خۆشدەویست و نێوی «مۆکەخاتوون» بوو.

٢ـ کاتێ چەنگیزخان، سپای بە سەر کوڕەکانیدا بەش کرد، سەردارێکی بوو بە نێوی «مۆکە» کە دای بە جوغەتای کوڕی.

٣ـ توولیخان کوڕە چکۆلەی چەنگیزخان. ١٠ کوڕی بوو. کوڕی هەشتەمی نێوی «مۆکە» بوو.[١]

---

١ لاپەڕەکانی ٥٤، ١٠٨، ٥٥٤ کتێبی «جامع التواريخ» نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵلا

# میشیاو

**میشیاو** **Mîşyaw**

دوو دێی ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز بەم نێوەن:

١ـ میشیاوی سەروو (میشیاو علیا): .. ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی .. کەسە.

٢ـ میشیاوی خواروو (میشیاو سفلی): .. ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی .. کەسە.

میشیاو وشەیەکە ئاوێستایی، کوردی، فارسی و بنەماکەی وشەی «میش: مەڕ، پەز»ە.

مانای وشەکە دەبێتە: مەڕ، پەز ف میش، گوسفند

لە ئاوێستادا، وشەی «مەیشە Maeshe» بە مانای مەڕ، پەز و میش هاتووە.[١]

لە فەرهەنگی هەنبانەبۆرینەی هەژاردا، مەیشنا بە مانای مەڕە ف گوسفند.

لە فەرهەنگی عەمید کە فارسی؛ فارسیە وشەی «میش»ی بە وشەیەکی پەهلەوی زانیوە.

---

١ کتێبی «زبانشناسی کرد و تاریخ کردستان»، نووسینی بێهزاد خۆشحاڵی

# مەرخوز

مَرغُز **Merxuz**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ١٩٥ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٩٠٩ کەسە.

ئەم وشەیە مەغوولییە و نێوی پیاوانە. بۆ وێنە:

لە سەردەمی یەسووکای بەهادور (باوکی چەنگیزخان) و چەنگیزخان، سەرۆکی هۆزی کراییت نێوی «ئوونکخان» بووە. باپیری ئەم ئوونکخانە نێوی «مەرغوز» بووە و پێیان کوتووە مەرغووز بوویرقخان.[١]

دیارە لە ماوەی چەند سەدەدا پیتی «غ» سواوە و بووە بە «خ» و ئەوەش ئاساییە.

بە بڕوای من ئەم نێوە مەغوولییەش هەروەک هەموو نێوە مەغوولییەکانی دیکە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیلخانەکان (١٢٥٦؛ ١٣٣٥ی زایینی) لە سەر ئەو دێیە داندراوە.

---

١ ل ٨٨ و ٨٩ کتێبی «جامع التواریخ»، نووسینی ڕەشیدەدین فەزلوڵڵا

# مەولاناوا

مَولان‌آباد **Mewlan awa**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی خورخـورەی سـەقز. ١٢٤ مـاڵە و ژمـارەی دانیشتووانی ٦١١ کەسە.

بۆ دیتنەوەی ڕەچەڵەکی ئەم نێوە چەند بۆچوون هەیە:

**بۆچوونی یەکەم.** ئەم نێوە پێکهاتەیەکە لە عەرەبی و کوردی:

(مەولان: خوا، خودا، یەزدان[ف] خدا، یزدان) وشـەی «مەولان» لە دیـوانی مەولەوی تاوەگۆزیدا زۆر جار دەکەوێتە بەرچاو:

ئەبرۆ کەمانێ پەیکان موژانێ

سەوڵ خەرامانێ، مەولان نیشانێ[1]

+ (ئـاوا: ئـاوەدان، شـوێنی ژیـان و مـانەوە؛ دژی وێـران[ف] آبـاد؛ جـایی کە مردم در آن زندگی می‌کنند)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێنێکی خودا ئاوەدانی کردۆتەوە[ف] محل و مکانی کە خدا آباد کردە است.

**بۆچوونی دووهەم.** نێوێکە لە دوو بەشی عەرەبی و کوردی پێکهاتووە:

(مەولا: خاوەن، سەروەر، گەورە، یەزدان، خودا[ف] مالک، سـرور، دوسـت، خدا) + (ناوا): سواغدەر، کەسێکی قوڕ بە جێگایەکدا دەسـاوێ؛ قوڕسـاوین بە دیوار و بانی ماڵدا[ف] گل اندود کردن، سابیدن گل بر روی دیوار و بام خانە)

---

١ ل ٥٢٨ دیوانی مەولەوی، مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس

**مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** شـوێنێکی خـودا سـواغی داوە؛ جێیەکـی مەولا (یەزدان) سـواخی کـردووە؛ف محـل و مکـانی کە خـدا گلانـدودش کـردە باشد.

دیـارە مەبەسـت ئەوەیە یەزدان ئەو جێیەی ئـاوەدان کـردۆتەوە؛ف منظـور آن است کە خدا آن مکان را آباد نمودە است.

لە شێعرێکی مەولەویدا ئەو واتایە وەبەرچاو دەکەوێ:

یانەی دڵ وەفەیز ڕای مەولا، ناوا

تەوار تەرلان، لان مەولانئاوا[1]

**بۆچوونی سێهەم.** پێکهاتەیەکە لە دوو بەش:

(مەولانـا: عینـوان و بـابەتێکی ڕێزگـرتن و ئیحتـرامە بـۆ پیاومـاقوولان و کەسانی پایەبەرز؛ مەولای ئێمە؛ ساحیب و سـەروەر و ئاغـای ئێمە؛ف عنوانی احترامآمیز برای افراد بزرگ؛ مولای ما؛ صاحب و آقای ما) + (ئاوا: ئـاوەدان؛ شوێنی ژیان و مانەوە؛ دژی وێران؛ف آباد؛ خرم؛ قابل سکونت)

کەوابـوو **مانــای ســەرجەمی وشــەی مەولانــاوا دەبێــتە:** ئەو دێـیەی «مەولانا» ئاوەدانی کردۆتەوە؛ف محلی کە «مولانا» آن را آباد نمودە است.

بەڵام با بزانین «مەولا»، «مەولان»، «مەولانا کێیە؟

ئەوەنـدەی لە بیرمـان بێ، کەسـایەتی ناسـراو و بەڕێز کە لە نێو خەڵکـی وڵاتانی دەوروبەر بە تایبەت لە نێو جەمـاوەری کوردسـتاندا بە نێوی مەولانـا ناسرابوو، مەولانا خالیدی نەقشبەندی بوو (لەدایکبووی ١١٩٣ کۆچی مانگی، لە دنیا دەرچووی ١٢٤٢ کۆچی مانگی). بەڵام مێژووی ژیانی ئەو کەسـایەتییە لانیکەم ١٠٠ ساڵ پاش ژیانی عـارفی گەورە شـێخ حەسـەنی مەولانـاوا بـووە

---

١ سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٣

(لەدایکبوون ١٠٧٧ کۆچی؛ لە دنیا دەرچوون: ١١٣٦ کۆچی)، کەوابوو ناکرێ ئەو مەولانایەی باسمان کرد، مەولانا خالیدی نەقشبەندی بێت، هەرچەند تەریقەتەکەشیان جیاوازی بوو.

لایەنی دووهەمی ئەم باسە ئەهلی هەق (یارسانیەکان) دەگرێتەوە. هەروەک لە یەک دوو جێی دیکەدا باسمان کردووە، دامەزرێنەری ئایینی یارسان موبارەکشا یا شاخوشێن بووە کە لە ساڵی ٤٠٦ی کۆچی مانگی یا ١٠٢٠ـ١ی زاینی لەدایکبووە. ئایینەکەی لە زۆر جێ ناسراوە و پەرەی سەندووە هەروەک توانیویەتی بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی خورخورە و سەرشیوی سەقز بگرێتەوە: ئاوایی ئیسحاقئاوا، دەرەشێخان، خۆشێنان و...[1]

لێرەدا من بڕوام وایە کە دێی مەولاناواش هەر لە پێوەندی لەگەڵ یارسانیەکان ئەم نێوەی بۆ هەڵبژێردراوە. مێژووی ژیانی شێخ حەسەنی مەولاناوا و شاموبارەک نزیکەی ٧٠٠ ساڵیان بەینە و دەکرێ بڵێین ساڵیانێکی دوور و درێژ ئەو ناوچانەی خورخورە و سەرشیو و ئەوانی تر لە ژێر تین و تەوژمی یارسانیەکاندا بووە. هەروەک دەزانین بە پێی ڕەویە و ڕەوشتی دینی ئەهلی هەق، «خوای گەورە» حەوت جار لە قەوارەی بەشەردا دێتە خوارەوە. بۆ ئەم مەبەستەش شێوەی پێکهاتنی ئەم ئایینە بەندە لە سەر گیانی «دۆنادۆن»، لەسەر بنەڕەتی زنجیرە. بۆ وێنە حەوتەوانە ئەمانەن:

١. مەولا ٢. شاموبارەک ٣. سانسەهاک ٤. ؟ ٥. ؟ ٦. ؟ ٧. ؟

هەریەکێ لەم حەوتەوانەیە لە دەم و چەرخێکی تایبەتی پێویستدا دێتە خوارەوە.

---

١ ل ١٤٠ و ١٤١ کتێبی «ڕەسەنایەتی زمانەکەت بناسە»، محەممەدئەمین هەورامانی

کەوابوو مەبەست ئەوەیە کە ئەم ئاواییە «مەولا» دروستی کردووە کە هەر دەبێتە خودا و ئەویش دەبێتە «مەولاعەلی» و ئەویش هەر شاەموبارەکە و شاەموبارەکیش هەر سانسەهاکە.

ڕەنگە هەندێ کەس بڵێن شێخ حەسەنی مەولاناوا شێخێکی پایەبەرزی تەریقەتی قادری بووە کە دەبووە موریدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (لەدایکبوون ١٠٧٧ی زایینی، لە دنیا دەرچوون: ١١٦٦ی زایینی).

دەیجا چۆن نێوی ئاواییەکی کە جێگەی ژیانی شێخێکی گەورە و پایەبەرزی تەریقەت و ڕێبازی قادری بێ، بە نێوی یەکێک لە حەوتەوانەی ئایینی یارسانی دەکەن؟

من پێموایە بەر لەوەی شێخ حەسەنی مەولاناوا لە ئاوایی خورخورە لەدایکبێ، ئەو دێیە هەر «مەولانئاوا» بووە. بەڵێ ئەگەر ئەو نێوە خودی شێخ هەڵیبژاردبایە، دەمانتوانی بە پتەوی لەسەر ئەو باوەڕە بین کە ئەم نێوە لەگەڵ «مەولا»ی یارسانیەکان هیچ پێوەندییەکی نییە. بەڵام هەروەک باسمان کرد دامەزرانی ئایینی یارسان و پەرە سەندنی لە ناوچەی خورخورەی سەقز دەگەڕێتەوە بۆ لانیکەم ٦٠٠ ساڵ بەر لە لەدایکبوونی جەنابی شێخ حەسەنی مەولاناوا و سەردەمی تورکانی سەلجووقی کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی مانگی و یازدەهەمی زایینی لە ئێراندا دەستەڵاتیان بە دەستەوە گرت.

**بۆچوونی چوارەم.** لە کوردەواریدا، مەولان نێوی پیاوانە. ڕەنگە مەولان نێوێک ئەو شوێنەی ئاوەدان کردبێتەوە و نێوی خۆی لە سەر دانابێ.

# مێتوو

میتو                                                    Mêtû

دێیەکە سەر بە ناوچەی تەمۆغە. ٢٢ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٢٠ کەسە.

ئەم وشەیە کوردی زاراوەی هەورامیە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(مێ: مەڕ، مەیە، مەیێ، پەز، پەسفمیش، گوسفند) + (توو: وڵات، شوێن، جێفمکان، جا، سرزمین)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** وڵاتی مەڕ؛ شوێن و جێیەکی مەڕی لێیەفمکان و سرزمین گوسفندها

ئەم نێوە بە شێوە و فۆرمێکی دیکە لە وڵاتی کوردەواری هەیە ئەویش وشەی (پەسوێ)یە کە لە دوو بەش پێکهاتووە:

(پەس: مەڕ، پەزفگوسفند، میش) + (وێ: وڵات، شوێن، جێفمکان، محل)

کە سەرجەم دەبێتە: وڵاتێکی مەڕی لێیە؛ شوێن و جێی مەڕفسرزمین گوسفندها.

کەوابوو مانای پەسوێ: مێتووە

---

١ فەرهەنگی سێ زمانەی ئاسۆ، نووسینی ئەمیر ئەمینی

# میک

**میک** **Mîk**

دێـیەکە ســەر بە نــاوچەی زولفەقــاری سەرشــیوی ســەقز. ٥٢ مــاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٨٩ کەسە.

(میک: مەڕ، پەز، پەس ف گوسفند)

هۆی نێونانی ئەم دێیە بە وشـەی میک یا مەڕ ئەوە بووە کە مەڕی زۆر لێ بووە.

لەم چەشنە نێوە دەتوانین ئاماژە بە وشـەی میشیاو بکەین کە بە مانای مەڕە. هەروەها وشـەی پەسوێ لە ئازەربایجانی ڕۆژئاوابیش هەر بە مانای شوێن و جێگای مەڕە.

# مەڵقەرەنی

**مَلقَرَنی** **Melqerenî**

ئـاوایییەکە سـەر بە نـاوچەی تەمـۆغە. ٩٦ مـاڵە و ژمـارەی دانیشـتووانی ٤٥٦ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە دوو بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(مەڵ؛ ماڵ: پاتاڵ؛ حەیوان ف دام؛ حیوان) + (قەرە؛ قەرا: ڕەش ف سیاه) + (نی: پاشگری پێوەند و نیسبەت ف پسوند نسبت)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شوێن و جێگای پاتاڵ؛ جێگای حەیوان ف محل و مکان دام؛ جا و مکان گاو و گوساله

**دووهەم.** وشەکە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(مەڵ؛ ماڵ: مەنزڵ، ماڵ، جێی ژیان ف خانه، منزل) + (قەرەنی: ناوە بۆ پیاوان ف نامی برادی مردان)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ماڵی قەرەنی ف منزل و خانەی قرنی

وا دیارە یەکەم جار پیاوێک بە نێوی قەرەنی ئەو ئاوایییەی ئاوەدان کردبێتەوە.

من بۆچوونی یەکەمم پێ ڕاستترە.

---

١ فەرهەنگی تورکی ـ فارسی شاهمەرەسی

# مەزرە

مزره **Mezre**

دێیەکە سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیوی سەقز. ٣٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٩٦ کەسە.

**یەکەم.** ئەم نێوە کوردییە:

(مەزرە: مەرزە، جاترە، هەزوێ، نەعناکێویلە[ف] آویشن، گیاهی علفی خودرو و معطر با برگهای کوچک و ساقەی کوتاه که مصرف خوراکی دارد؛ آویشن کوهی؛ آویشن شیرازی)

**دووهەم.** ئەم نێوە کوردییە:

(مەزرە: مەزرا؛ زەوی بۆ کشتوکاڵ[ف] مزرعه؛ زمین کشاورزی)

# مێرگەنەخشینە

**Mêrgenexşîne** **میرگه نقشینه**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز. ٥٦ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٤٠ کەسە.

وشەیەکی کوردییە و لە چوار بەش پێکهاتووە:

(مێرگ: چیمەن، گیاجاڕ، جێی پڕ لە گیا و بژوێن و لەوەڕگە، زەمەند، زەنوێر ف چمن، چمنزار، مرغزار، سبزەزار، زمین سبز و خرم) + (ە: های ناسێنەر، وشەی پێش خۆی دەناسێنێ ف حرف تعریف، حرف شناسە) + (نەخش: ڕەسم، فۆرم، شکڵ، شوێنێک کە لە سەر زەوی یا شتێکی دیکە بەجێمابێ ف تصویر، شکل، اثری کە روی زمین یا چیزی باقی ماندە باشد.) + (ینە: پاشگر یا پاشبەندی نیسبەت، لەگەڵ نێو، ئاوەڵناو بەدیدێنێ، لە ڕەنگی، وەک ف پسوند نسبت و شباهت، اسم + ین/ینە ایجاد صفت می‌کند مانند چوبینە، پشمینە و در اینجا نقشینە)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** مێرگ و چیمەنی ڕەنگاوڕەنگ، لەوەڕگە و چیمەنێکی دەڵێی نەخشت لێ کێشاوەتەوە ف چمنزار رنگارنگ، مرغزار رنگین و منقش

دیارە مەبەست ئەوەیە ئەو شوێنە مێرگ و مەزرا و گژوگیایەکی زۆر و ڕەنگاوڕەنگ بە سیما و دیمەنێکی جوانی لێ بووە و بەم هۆیەوە، ئەو جێگایەیان نێو ناوە: مێرگە نەخشینە.

# مووسماوا

**موسم‌آباد** **Musimawa**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی خوڕخـوڕەی سـەقز. تەنیـا یەک مـاڵە و لە سەرژمێریدا ڕێژەی دانیشتووانی دیاری نەکراوە.

**بۆچــوونی یەکەم.** وشـــەیەکە لە دوو بەشـــی «عەرەبــی و کــوردی» پێکهاتووە:

(موسم: وشەیەکی عەرەبیە، کات و زەمانی شتێک، کاتی گەیشتنی شتێک، وەرز، فەسڵ ف وقت و زمـان چیـزی، هنگـام رسـیدن چیـزی، فصـل) + (ئـاوا: ئاوەدان، شیاوی ژیان و گوزەران ف آباد، قابل سکونت و زندگی کردن)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ئـاوایی یـا شـوێنێک کە تەنیا لە هێندێ وەرز یـا کاتـدا ئـاوەدانە و خەڵکی لێ دەژی. بـۆ نمـوونە بـۆی هەیە ئەو دێیە تەنیـا لە بەهـاران و هاوینـدا ئـاوەدان بـێ. دەتـوانین بڵێـین شـتێکە وەک هەوار «کوێستان» و قشلاخ «گەرمێن».

لەم چەشنە نێوانە لە ناوچەکەدا هەیە، بۆ نموونە:

یـازیبڵاغی، وشـەیەکی تورکییە و لە دوو بەش پێکهـاتووە: یـازی ـ یـاز: بەهـار + بـڵاغ ـ بـولاغ: کـانی. مەبەسـت ئەوەیە ئەو کـانی و چەشـمەیە تەنیـا بەهارانە ئاوی هەیە.

**بۆچوونی دووهەم.** وشەکە کوردییە و دوو بەشە:

(مووسـم: نێوە بۆ پیاوان، وەک مووسمبەگ ف نامی است برای مـردان) + (ئـاوا: ئـاوەدان، شـوێنێکی بکـرێ تێیـدا بـژی ف آبـاد کـردن، قابـل سـکونت و زندگی)

**کەوابـوو مانـای تێکڕای وشـەکە دەبێتە:** مووسـم ئـاوەدانی کـردۆتەوە ف موسم آن را آباد کرده است.

دەکـرێ بڵێـین هـۆی ئەم نێونـانە ئەوە بـووبێ کە یەکەم جـار پیاوێـک بە نێوی مووسـم یا مووسمبەگ ئەو شوێنەی ئاوەدان کردبێتەوە.

# میرەدێ

**Mîrede** **میردە**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێی سەقز و ناوەندی دێهستانەکەیە. ١٤٠ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٨٠٥ کەسە.

**یەکەم.** میرەدێ وشەیەکی کوردییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(میر: سەرۆک، سەردار، لاتەنیشتی قووڵی جگ یا قاپ، هەویر[1] ف امیر، سالار، طرف گود شتالنگ، خمیر) + (ە: هـای ناسێنەر ف هـای معرفـه و شناسە) + (دێ: ئاوایی، گوند، دەگا ف دە، روستا، آبادی)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** دێی گەورە پیاو و میر، دێی سالار و سەرۆک ف روستای امیر، آبادی سالار

**دووەم.** وشەیەکی کوردییە و دوو بەشە:

(میرە: بەگ، ئاغا، کوێخا، نازناوی پیاوماقووڵی کاکەیی، شوو، مێرد، ئازووخەی دەوڵەتی، جێژوان[2] ف بیگ، آقا، کدخدا، لقب مردان اهل حق، شوهر، سررشتەداری، میعادگاه) + (دێ: ئاوایی، گوند ف آبادی، روستا، دە)

**واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** ئاوایی قەوغا و زۆر ئاوەدان، دێیەکی میری لێ دەژی، گوندێکی زۆر گەورە و جێی ئەنبار و ئازووخەی دەوڵەتی ف آبادی بسیار بزرگ و پر جمعیت، محل زندگی امیر، روستای بسیار بزرگ و محل آذوقە دولتی

* لە مەهابادیش دێیەک هەیە بە نێوی میرەدێ کە سەر بە ناوچەی ئێل تەیموورە.

---

١و٢ فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، هەژار

# مازوار

**مازوجدار** **Mazuar**

دوو دێ بەم نێوە لە سەقز هەیە:

١ـ مازواری سەر بە ناوچەی زولفەقاری سەرشیو (مازواری شێخ عەبدوڵڵا)، ٢٨ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٤٦ کەسە.

٢ـ مازوارەی سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٣٣ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٧٣ کەسە.

(مازوو: ١ـ بەڕوو ٢ـ بەری داری بەڕوو، مازوو کە بە گەزینی ئەم دارە لە لایەن حەشەرەیەکەوە بەدیدێت. لە پیشەسازیدا بۆ دروست کردنی جەوهەر «مورەکەب» و ڕەنگ کردنی پارچە و قوماش و لە چەرم و پێستە خۆش کردندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ. پێنج جۆر داری مازوو لە ئێراندا هەیە: بڵێند مازوو، کەرمازوو، مازوویەکی ئاسایی، ئووری، بەڕوو «بلوط») + (ار: دار بووە کە پیتی «دال»ەکەی لە ئاخاوتندا قرتاوە ف دار، چوب، درخت)

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەکە دەبێتە:** داری مازوو، داری بەڕوو ف درخت بلوط، درخت مازو

دەکرێ بڵێین هۆی ئەوەی ئەم ئاواییانەیان نێو ناوە «مازوار» زۆر بوونی ئەو دارە لەو شوێنە و لە ناوچەکەدا بووە.

چەند دێیەک کە نێوەکەیان وشەی مازووی لەگەڵە:

* مازوو: دێیەکە لە شاری ئەندیمێشک

* مازووبن: دێیەکە لە شاری ڕودسەر

* مازووبنی باڵا: دێیەکە لە شاری شەهسەوار

* مازووبنی پایین: دێیەکە لە شاری شەهسەوار

# نویین

**نوین** **Niwîn**

دێیەکە سەر بە ناوچەی خورخورەی سەقز. چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی.

ئەم وشەیە مەغوولییە:

نویین: سەردار، سەرۆک ف امیر، سردار[۱]

وەک: ئیلکانویان ئەو ئەمیرە گەورەیەی لەگەڵ هۆلاکۆ هات بۆ ئێران.

ــ ئۆلغنویین (الغنوین) نازنێو یا لەقەبی توولی کوڕی چوارەمی چەنگیزخان بە مانای ئەمیری گەورەیە.

۱ ل ٤٩٥ کتێبی «تاریخ جهانگشای جوینی» نووسینی عەتامولک جوەینی

# نەمەدینە

نَمَدینە　　　　　　　　　　**Nemedîne**

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی سـاحێب. چـۆڵکراوە. ئەوانەی لەوێ زەویـی کەشاوەرزییان هەیە، هاتوچۆ دەکەن.

ئەم وشەیە کوردی و فارسییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

نەمەد: نەمەد؛ لبـاد؛ کـولاڤ؛ بەرگنـی پەسـتواو[ف]نمـد) + (یـنە: پاشـگری پێوەند و نیسبەت[ف]پسوند نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** وەک نەمەد؛ وەک لباد؛ لبـادینە[ف]مثل نمد، نمدینە

ئەم ئـاوایییە بە هـۆی ئەوەی لە قەراغ چـۆم هەڵکەوتـووە و زەویەکـانی دەشتایی و نەرمانن، بەم نێوە نێونراوە و بەنێوبانگ بووە.

# نەکەرۆز

**نَکَروز** **Nekeroz**

کێوێکە لە بەرزاییەکانی زنجیرەکێوی زاگرۆس و نزیک بە ٢٦٤٠ میتر بەرزە.

نەکەرۆز لە بەینی ئاواییەکانی پیرئۆمەران، دەرەی ئاوی و باینجاندا هەڵکەوتووە.

حەوزەی ئاوەڕۆ (آبخیز)ی ئەم کەژە، چۆمی جەغەتووە «زرینەرود». گژوگیا و بوورەیەکی زۆر باش و دەوڵەمەندی هەیە و داری بەڕوو، قەزوان «ون» و بادام لەوێ دەست دەکەوێ.

وشەی نەکەرۆز یۆنانییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(نەکە: نیکە، بردنەوە، سەرکەوتن و بە ئاکام گەیشتن ف پیروز شدن، چیرە شدن)

نیکە خوداژن «الاهە»ی باڵدارە و بە نیشانە و هێمای سەرکەوتن «پیروزی» لە میتۆلۆژیای یۆنان و ڕۆمدا دێتە ژمار.[1] نازنێو «لقب»ی ڕاستەقینە و ئەسڵی ئاتێنا، خوداژن یا ئیلاهەی فام و شعوور و عەقڵ "Minerve"، نیکە یا سەرکەوتنە کە خەڵکی ئاتێن لە بەر خۆشەویستی پێی دەڵێن «ئاتێنانیکە» یا ئاتێنای براوە و سەرکەوتوو. ئاتێنا «"Minerve" ئیلاهە و خوداژنی عەقڵ و فام» لە خودایانی دوازدەوانەی میتۆلۆژیا «ئەساتیر»ی یۆنان و ڕۆم و کچی زئووس «خودای خودایان» و «متیس»ە.[2]

---

١ ل ٢٦٢ کتێبی «مبانی فلسفی اساطیر یونان و روم» جلد اول، نووسەر، دوکتۆر سەعید فاتمی

٢ ل ٢٩٥ سەرچاوەی پێشوو.

وشەی «نیکە Nikê» لە ماوەیەکی دوور و درێژ یانی لە نزیکەی ١٧٠٠ ساڵدا (لە ساڵی ٣٣١ی ب.ز. کە یۆنانییەکان ئێرانیان داگیر کرد هەتا ئێستا کە ٢٠١٢ی زایینییە) لە نێو خەڵکی ناوچەکەدا ماوە و زمان بە زمان و سینە بە سینە هاتووە و تەنیا لە گفتوگۆدا بڕێک سواوە. ئەویش ئەوەیە کە «نیکە» بە «نەکە» دەخوێندرێتەوە.

+ (رۆز، رۆس، ئاکرۆس: بەرز، بەرزایی، بڵیند ف آکروس، بلند، مرتفع)

با بزانین ڕەگەز و بنچینەی ئەم وشەیە چییە و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە:

هێندێک لە مێژوونووسانی بواری میتۆلۆژی «ئەساتیری» یۆنان و ڕۆم «وەک ئانتی گۆنۆس» نووسیویانە: ئاتێنا «آتنا، خودای عەقڵ و فام» منداڵەکەی خۆی دا دەستی کچانی سکروپس «یەکەم شای ئەفسانەیی ئاتێن» و خۆی گەڕاوە بۆ پالێنە pallene کە دێیەک بوو لە ناوچەی ئاتیک هەتا شوێنێکی قورس و قایم بۆ شاردنەوەی منداڵەکەی بدۆزێتەوە. لە ئاکامدا شاخێکی دیەوە کە دواتر نێویان نا «ئاکرۆپۆلیئاتێن ـ آکروپل آتن». ئاکرۆپۆل لە ڕاستیدا بە بارەگای ئاتێنا دەژمێردرێ.[1]

وشەی ئاکرۆپۆل لە یۆنانیدا «ئاکرۆس ـ آکروس Akrose» بە واتای بڵیند و بەرز، و پۆلیس polis بە مانای شار «شهر» پێکهاتووە.

لە پێکهاتەی دوو وشەی «نیکە» و «ئاکرۆس» وشەیەکی تازە پێکدێ بە نێوی نیکەئاکرۆس. ئەم وشەیە هەروەک لە پێشدا ئاماژەمان پێ کرد، لە ماوەیەکی دوور و درێژدا «لە ٣٣١ی ب.ز. هەتا ٢٠١٢ی زایینی» لە سەر زاری خەڵک بووە بە نەکەرۆز.

---

١ ل ٢٩٤ کتێبی مبانی فلسفی اساطیر یونان و روم، دوکتور سەعید فاتمی.

**کەوابوو واتای سەرجەمی وشەی نەکەرۆز دەبێتە:** بەرزایی سەرکەوتن، بڵیندی سەرکەوتن، کەژ و چیای سەرکەوتن ف بلندی پیروزی، کوه پیروزی، ارتفاعات پیروزی.

یۆنانییەکان ئەم نێوەیان لە وشەگەلی بواری میتۆلۆژیی یۆنان و رۆم کە زۆر جێی شانازی هێلێنییەکان بووە، بۆ نێوی ئەو کێوە هەڵبژاردووە. دەبێ ئەوەش بزانین بناغە و ئەساسی وشە و نێوەکانی دیکەش وەک زاگرۆس و ئاسۆس و بابۆس هەر لە مێژوو و میتۆلۆژی یۆنانی هەڵقوڵیوە، نەک وشەی مادی و کوردی و ئێرانی. لە نەخشەی کوردستاندا لە سەر کێوی نەکەرۆز بە فارسی نووسراوە: «نیکروز» کە لە فارسیدا بە مانای خۆشبەخت و سەعادەتمەندە. هەرچەند ئەم واتایە بۆ وشەی نەکەرۆز هەڵەیە، بەڵام لە رووی رووالەتەوە دوو وشەی نیکە و ئاکرۆس زۆر جوان یەکتریان گرتووە و بوون بە نیکروز و نەکەرۆز.

**پیرەمێرد و نەکەرۆز:**[1]

نەکەرۆز گەڕام وادی بە وادی  شوێنی هەوارگەی ئێلی مورادی
هەر لە نەکەرۆز تا دەربەندیخان  ئەو ناوە یەکسەر شێواوە و وێران
پرسیم بایەقووش دۆستی هاودەردم  لە جیهان بێزار، یاری چۆڵگەردم
بۆچی وا چۆڵە ئەم مەرز و بوومە  لە کوێ پەیدا بوو، وەیشوومەی شوومە
جوابی دامەوە بە قوڵپی گریان  منیش وا جەرگم بۆی بوو بە بریان
ئەمساڵ بەهارمان کە بێ بارانە  گوڵاڵەی سوورمان جەرگی یارانە
لە هەر سێ لاوە شاییە بە ڕیزە  خەنەبەندانمان، خوێنی ئازیزە

---

١ ل ١١٤، دیوانی پیرەمێرد، نووسینی محەمەد رەسووڵ هاوار، بڵاوکراوەی محەمەدی سەقز. لە چاردە بەیت تەنیا حەوت بەیتی لێرەدا نووسراوە.

# وزمەڵە

**وزمله** **wizmele**

دێیەکە سەر بە ناوچەی میرەدێ. ٤٥ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٥٣ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(وزم: چەشنێ دارە؛ دارەڕەش؛ ناروەند[ف] ناروَن)[١] + (ە: هـای ناسێنەر؛ های شناسە[ف] های معرفه) + (ڵە: بۆ چکۆلە کردنەوەی نێو بەکاردێ وەک: کۆرپەڵە؛ دیزەڵە[ف] های تصغیر و کوچک کنندەی اسم)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** داری ناروەندی چکۆلە؛ دارەڕەشە چکۆلە [ف] درخت نارون کوچک

١ هەنبانەبۆرینە ـ هەژار

# وەرەنانی

**وەرەنانی** **werenanî**

ئاوایییەکی چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی. لە نێوان دوو دێی هێجانان و سەڵتەکەڵتوو هەڵکەوتووە.

ئەم وشەیە کوردی؛ ئاوێستایییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

وەرە: وەر. لە زمانی پەهلەویدا: وارە؛ بارە: برج. دژ، قەڵاف دژ، قلعە، برج) + (نانی، نیانی، نهێنی: شاردراوەف پنهانی، نهانی)

ئەم وشەیە لە نێو زمان و زاراوەکانی دیکەدا بەم چەشنەیە:

| پەهلەوی | تاتی | تالشی | فارسی |
|---|---|---|---|
| نیهان | نیان | نون | نهان[1] |

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** قەڵای نهێنی؛ قەڵا و دژی شاردراوەف قلعە و برج و باروی نهانی

دەتوانین بڵێین مەبەست لە قەڵای نهێنی و شاردراوە، شوێن و جێیەکە لە دۆڵ و دەرە و پشت کێو هەڵکەوتبێ و دوورەدەست بێ و زۆر دیار و لەبەرچاو نەبێ.

وشەی نهێنی لە درێژایی زەماندا سواوە و لە قسەکردن و وتندا بووە بە نیانی و دواتر بووە بە نانی.

١ کتێبی «تالشی‌ها کیستند؟» نووسینی عەلی عەبدولی، ل ٥٤

لەم بـابەت و بـوارەدا شـیعرێکی فۆلکلـۆر هەیە کە هونەرمەنـد مـاملێ بە گۆرانی گوتوویەتی:

ئەوەندەم هەڵکێشا ئاخی نیانی
دڵ لە دەروونِدا بوو بە بریانی

**دووهەم.** ئەم وشەیە کوردییە و ماناکەی دەبێتە:

(نانوەرە یان نانبەرە: سفرەی نان، ناندێن ف سفرەی نان، نانِدانی)

پێموایە هـۆی ئەو نێونـانە ئەوەیە، ئەو ئـاواییە شـوێنێکی چـاک بـووە بـۆ کشــتوکاڵ و ئاژەڵــداری و لە ڕاســتیدا وەک ســفرە و نانــدێن وا بــووە بــۆ خەڵکەکە لە زمانی هەورامیدا دەڵێن: تۆشەوەرە یا تۆشەبەرە.[1]

١ فەرهەنگی سێ زمانەی ئاسۆ، نووسینی ئەمیر ئەمینی، ل ١٣٠

# هۆوەتوو

**اوباتو** **Howetû**

ناوچەیەکی پانوبەرینە، لە مابەینی سەقز و دیواندەرە هەڵکەوتووە.

ئاواییيەکانی هۆوەتوو بریتین لە: بایزاوا، حوسێنئاوای مەڕان، خاکیبەگ، زەکیبەگی خواروو، زەکیبەگی سەروو، ڕەحیمکوژیاو، عەلیاوای کەرەفتوو، عەلیاوای مەڕان، قەڵاچوخە، قەڵاکۆن، کانیکەوەی مەڕان، کەڵەکەجار، کەرەفتوو، گۆڕباوەڵێ، مەڕانی سەری، مەسعووداوا، یووزباشیکەندی، فەتاحئاوا، کانیچەرموو، جەیرانمینگە، چاڵگە، ناسراوا، بەردەڕەشە، کانیسوور، قەڵاگا، عەلیمەردە، قادرئاباد، کانیسەیدشوکرە، شەریفئاباد، سێتەپان، قاچیان، سەیدئاباد.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە ئاوێستاییيە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(هۆ: چاک، باش، خاسفخوب) + (توو: وڵات، شوێن، جێفمحل، سرزمین)

واتای وشەکە دەبێتە: وڵاتی چاک؛ شوێنی باشفسرزمین و محل و مکان خوب

**دووهەم.** وشـــەی هـــۆوەتەو Huwataw لە ئاوێســـتادا نازنـــاوی «جەمشید»ە[١] و واتاکەی خاوەنی ڕانەمەڕی چاک و باشە ف دارندەی گلە و رمەی خوب

**سێهەم.** وشەی هۆوەتوو پێکهاتەیەکی تورکی؛ ئاوێستاییيە:

(ئۆبە؛ اوبە: چیغ، چادر، خێوەت ف چادر) + (توو: شوێن، جێ، ئۆردوو ف محل یا مکان)

واتاکەی دەبێتە: شوێن و وڵاتی خێوەتەکان ف سرزمین و مکان چادر و اردوها.

بە ڕای من بۆچوونی یەکەم لەوانی دیکە ڕاستترە.

---

١ ل ١٠١ کتێبی «شناخت اساطیر ایران»، نووسینی جان ڕاسێل هینلز

# هەوی[1]

Hewî　　　　　　ایوب

دێیەکە سەر بە ناوچەی تیلەکۆ. ٣٩ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٩٥ کەسە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە ئاوێستاییە. هۆوی یا هەوی، کچی پیاوێک بووە بە نێوی فەرشوشتۆر (فرشوشتر) کە وەزیری «کەیگوشتاسب "کیگشتاسب") بووە. ئەم پیاوە برای جاماسب وەزیری «کەیگوشتاسب» بووە. هەوی، ژنی زەرتوشت پێغەمبەری زەرتوشتیەکان بووە.

کەوابوو دەتوانین بڵێین ئەم ئاواییە دێیەکی زۆر کۆنە و نێوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی باوەڕی خەڵکی ئێران بە ئایینی مەزدەیەسنا (زەرتوشتی) یا بە زمانێکی دیکە، دەتوانین بڵێین ئەم نێوە یادگاری سەدەکانی دەسەڵاتی ماد هەتا کۆتایی دەسەڵاتی ساسانیەکانە.

**دووەم.** ئەم وشەیە کوردییە و واتاکەی: هەنە، هەڤی، هەوە، هەوێ، دوو ژن شوویەکیان بێ؛ دوو ژنی مێردێک بۆ یەکتر[ف] دو زن کە یک شوهر داشتە باشند؛ همشوی؛ وسنی؛ هوو

---

[1] ل ٢٥ و ٢٥٨ کتێبی (سرودهای زرتشت)، وەرگێڕانی بزۆرگمێهری کیانی

# هەنگەچینە

Hengeçîne هنگەچینە

دێـیەکە سـەر بە نـاوچەی زولفەقـاری سەرشـیوی سـەقز. ١٩ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ١٠٦ کەسە.

ئەم وشەیە کوردییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(هەنگ: مێشهەنگوین[ف]زنبور عسل) + (چینە: چنینەوە؛ کۆکردنەوە[ف] جمع کردن؛ چیدن؛ اصطلاحا: خوردن)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** باڵندەیەکی هەنگ دەچنێتەوە؛ باڵندەیەک هەنگ دەخوا[ف]پرندەای کە زنبورعسل میخورد؛ پرندەای کە زنبورعسل شکار میکند.

ئەم باڵندەیە (هەنگەچینە) چەند نێوی دیکەشی هەیە: کەندەسمە، هەنگەخۆرە مێشخۆرە[ف]سبزقبا

دەکرێ بڵێین چونکە ئەو ئاواییە هەنگەخۆرەی زۆر بووە، نێویان ناوە هەنگەچینە.

# هەباسەڕەقە

**عَباس‌رَقَه** **Hebase reqe**

دێیەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی جانگیرخان. ئێستا چۆڵکراوە و کەسی تێدا ناژی و تەنیا هاوینان لە زەویەکانیدا کشتوکاڵ دەکرێ.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە چەند مانا و بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە کوردییە:

(هەباس: عەبباس، نێوە بۆ پیاوان[ف]عباس، نامی برای مردان) + (ڕەقە: ڕەق‌وتەق؛ کز و لاواز[ف]لاغر؛ ضعیف؛ بی‌بنیه)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** هەباسی کز و لاواز[ف]عباس لاغر و مردنی

دەکرێ بڵێین ئەو ئاواییە بە نێوی خاوەنی هەوەڵیەوە کراوە.[ف]روستا به نام مالک آن نامگذاری شده است و مالک اولیه آنجا لاغر و ضعیف بوده است.

**دووهەم.** وشەکە کوردییە:

(هەباس: عەبباس، نێوە بۆ پیاوان[ف]عباس، نامی برای مردان) + (ڕەقە: کیسەڵ[ف]لاک‌پشت آبی)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** هەباسەکیسەڵ[ف]عباس لاک‌پشت

یانی ئەو ئاواییەیان بە نێوی خاوەنی زەویەکان کە پیاوێکی چکۆلەی پشت‌کووڕ بووە کردووە.[ف]نام روستا برگرفته از مالک آبادی که جثه‌ای کوچک و گوژپشت داشته، می‌باشد.

**سێهەم.** وشەکە عەرەبیە:

(هەباس: عەبباس، نێوی پیاوانەیە[ف]عباس، نامی برای مردان) + (ڕەقە، ڕقة: لە قامووسی «المحیط»دا ڕقة بە وڵاتێک گوتراوە کە لە پاڵ دەریا یان لە پاڵ شیو و دۆڵ هەڵکەوتبێ)[1]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** ئەو ئاوایی و مەزرایەی هەباس کە لە نزیک دەریا یان شیو و دۆڵ هەڵکەوتووە.

**چوارەم.** وشەکە عەرەبیە:

(هەباس: عەبباس، نێوی پیاوانەیە[ف]عباس، نامی برای مردان) + (ڕقە، ڕقة: نەرمونیان؛ مێهرەبان؛ چاکەکار[ف]مهربان؛ نیکوکار)[2]

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** هەباسی پیاوچاک؛ هەباسی لەسەرەخۆ و مێهرەبان.

**پێنجەم.** وشەکە ئەکەدییە:

(هەباس: عەبباس، نێوی پیاوانەیە[ف]عباس، نامی برای مردان) + (ڕەققە، ڕەقە: چۆم، ڕووبار[ف]رودخانە)[3]

مانای وشەکە دەبێتە: ئەو ماڵ و مەزرایەی هەباس کە لە گوێ چۆمی هەڵکەوتووە.

---

١ ل ٨٩ فەرهەنگی وشەکانی ئەکەدی. نووسینی محەمەد داوود سەللوم. وەرگێڕدراوی نادر کەریمیان سەردەشتی

٢ سەرچاوەی پێشوو

٣ سەرچاوەی پێشوو

# هەبەکی

هَبَکی **Hebekî**

دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرا. ٤٣ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٢٠١ کەسە.

ئەم وشەیە مەغوولییە و تەنیا یەک بەشە:

هەبەکی: لە وشەی مەغوولی «هەباکی»[١] وەرگیراوە کە واتاکەی «جاڵجاڵووکە»یە. ئەم وشەیە بە تێپەڕ بوونی زەمان، ئاڵوگۆڕێکی ساکاری بە سەر هاتووە. لە کوردیدا کاکڵەمووشان، پسپسەکۆڵە و پیرۆشکیشی پێدەڵێن و لە فارسیدا بە مانای «تارتنک» و «تارتن»ە.

هەر بەم نێوە «هەبەک ـ هبک» شارێک هەیە کە لە باشووری شاری «خلم» هەڵکەوتووە. شاری خلمیش دوو ڕۆژە ڕێ لە شاری بەلخەوە دوورە.[٢]

هەروەک لە چەند جێی دیکەدا باسم کردووە، نێوی چەند شار و دێی ئێران بەتایبەت لە کوردستان و سەقز کە جێی‌باسی ئێمەیە، بە نێوی ئەو شارانەوە کراوە کە داگیرکەرانی مەغوول و تورک لەوێوە هاتوون. وەک:

١ ل ٥٣ کتێبی «کورد و مینۆرسکی، وتاری ناوی مەغوولی شوێن لە کوردستانی موکریان». نووسینی مینۆرسکی، وەرگێڕ: ئەنوەر سوڵتانی

٢ ل ٤٥٣ کتێبی «جغرافیای تاریخی سرزمین‌های خلافت شرقی»، گای لسترینج، مترجم: محمود عرفان

- ئاوایی چیچیخوار سەر بە ناوچەی ساحێب کە بە نێوی چیچیهاری مەغوولستانی نێوخۆیی (داخلی) چین کراوە.

- دێی تبتی بۆکان بە نێوی وڵاتی تبتی چینەوە کراوە.

- دێی شقۆیف لە سەقز کە بە ناوی شارێکی سووریەی سەردەمی خۆی کراوە و چەند جێی دیکەش.

# هیجانان

**هیجانان** **Hîcanan**

ئەو ئـــاوایییە ســـــەر بە نـــاوچەی تەمـــۆغەیە. ١٠١ مـــاڵە و ژمـــارەی دانیشتووانی ٥٠٥ کەسە.

بۆ لێکدانەوەی ئەم وشەیە سێ بۆچوون هەیە:

**یەکەم.** ئەم وشەیە پەیوەندی دوو وشەی عەرەبی و کوردییە:

(هیجـان: وشــەیەکی عەرەبیـیە، بە مانـای کەڵـلە داغبـوون، داگیرسـان؛ ســەرخۆش بـوون؛ گەرمداهــاتن؛ لە ســەر حـاڵەتی سوروشـتی لاچـوون ف برانگیختە شدن؛ مضطرب گشتن؛ بە جوش و خروش آمـدن) + (ان: پاشگری کۆ؛ نیشانەی جەمع ف پسوند و علامت جمع)

**مانـای تێکـڕای وشــەکە دەبێتە:** ئەوانەی گەرم داهـاتوون و وەهەیەجـان هــاتوون؛ ئەوانەی گیــان و ڕوحیــان وەجــۆش و خــرۆش کەوتــووە وەک دەروێشــەکان ف بە خـروش آمـدگان؛ هیجانزدەهـاماننـد دراویـش پیـروان طریقتهای مختلف.

**دووهەم.** وشەکە دوو بەشە:

(هیجـا؛ هَیجــاء: شــەڕ؛ پێکـدانان؛ تێـکهەڵچوون ف جنـگ، نـزاع) + (نـان: نیشانەی کۆ ف علامت جمع)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** شەڕ و پێکدادان؛ مەیدانی شـەڕ؛ شـەڕگە ف میدان جنگ؛ میدان کارزار؛ جنگ

**سێهەم.** ئەم وشەیە تێکەڵاوێکە لە دوو وشەی عەرەبی و کوردی:

(هـیج: ڕقهەسـتاو؛ تـووڕە/ خشـمگین) + (ان: وشـەیەکە لە زمـانی هەورامیدا کەڵکی لێوەردەگیرێ و ماناکەی «م» یا «هەم»ە. بۆ وێنە ئەگەر بڵێن «من کاوەم» دەڵێن «ئەز کاوەنان» یا «ئەو ولەنان» واتە ئەو گوڵەم.[1]

کەوابـوو **مانـای وشـەی هیجانـان دەبێـتە:** تـووڕەم؛ ڕقـم هەسـتاوە/ خشمگینم.

---

١ ل ٩٥ کتێبی «ڕەسەنایەتی زمانەکەت بناسە»، محەمەدئەمین هەورامانی

# یۆرقوڵ

**یورقُلْ** **Yorqul**

دێـیەکە ســەر بە نـاوچەی کـولتەپەی جانگیرخـانی سـەقز. ٨٧ مـاڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٣٦٨ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

(یۆر؛ یۆرد؛ یۆرت: ڕەشماڵ؛ خێوەت؛ چادر؛ ئۆردوو[1] ف چادر؛ اردوگاه؛ محل خیمه و خرگا؛ مسکن) + (قوڵ؛ قول: غولام، نۆکەر؛ سپا؛ نێوەڕاستی سپا ف غلام، بنده؛ قلب سپاه؛ ارتش[2])

بەو مەئمـوورانەی ســەر بە «بیگلەربەگـی»یـن دەڵـێن «غـولامبەگی»[3]. چونکە غولام هەر «قول»ی تورکییە، دەبێ بیخوێنینەوە قولبەگی کە دەبێتە سەرکردە و فەرماندەی غولامەکان یا خزمەتکارەکان.

هەرچۆنێک بێ، خوێندنەوەی ئەم وشەیە «قولبەگی: سـەرۆکی قۆڵێک یـا ســەرۆکی جناحێـک ف فرمانـده یـک جنـاح» کە هەر وشــەی «قولئـۆردوو "قولاردو"»ی باو لە حکوومەتی عوسمانیە کە نیاز و مەبەسـت «جنـاحی سـپا یا قۆڵێکی سپا»یە. ئیستلاحی ئۆردوو وشـەیەکی سـەردەمی مەغووله بۆمـان ماوەتەوە.[4]

---

١ ل ٣٧١ کتێبی «تاریخ ایران کمبریج»، بەرگی ٥، نووسینی جی ئابویل

٢ ل ١٠٤٩ کتێبی «ترکستاننامه»، ئولوغقول، اولغقول: ارتش بزرگ

٣ ل ٩٨ کتێبی «تذکرەالملوک»، محەمەد دەبیرسیاقی

٤ ل ٩٩ و ١٠٠ کتێبی «تذکرەالملوک»

سـپای مەغـوول لە شـەڕ و لەشکرکێشـیەکاندا بە لەبەرچـاو گرتنـی گرینگایەتیەکەی لە یەک یا چەند یەکە (واحد)ی دەهەزار کەسی پێکدەهات و لە ڕووی ڕێورەسـمی چینیەکـان بە «قـۆڵی ڕاسـت: بـروەنغەر» و «قـۆڵی چەپ: دەساغوونغەر» و لە ئاکامدا بە «قەلب "دڵ" و نێوەڕاستی سپا: قول» دابەش دەبوو.[1]

کەوابوو دەتوانین بڵێین وشەی یۆرقوڵ بە مانای "ئۆردووگای سپا؛ جێ و شوێنی نێوەڕاستی سپایە[ف] اردوگاه سپاه میانی؛ خیمە و خرگاه و اردوگاه ارتش.

بە بڕوای من سپای ئێلخانەکان لەو شـوێنە کە ئێستا ئـاوایی یۆرقـوڵی پـێدەڵێن ئۆردووگایـان لـێداوە. هۆیەکەشـی ئەوە بـووە ئەو شـوێنە لەوەرگـایەکی چـاک بـووە بـۆ ئەسـپەکانی سـپا و ئەو شـوێنە لە نـاوچەی هەوەتوو کە شوێنێکی پڕ گژوگیا و سەرسـەوز بـوو، ئەوەنـدە دوور نەبـووە. لە لایەکی دیکەوە وەک لە نێوەکەیەوە دەردەکەوێ ئەم دێیە جێ و شـوێنی قۆڵ و جناجی نێوەڕاستی سپای ئێلخانەکان لەو ناوچەیە بووە.

دەبـێ ئامـاژە بە بۆچـوونی هێنـدێک کەس بکەیـن کە پێیـانوایە یۆرقـوڵ، نێوی هێرکۆلە کە نیازێک بە لێدوان و بەڵگەهێنـانەوە ناکـا. بۆچـوونەکە زۆر ڕواڵەتی و سەرسەرەکی و هەڵەیە.

---

١ ل ٣٩٩ کتێبی «تاریخ مغول در ایران»، نووسینی برتۆلد ئیشپوولێر

# یازیبڵاغی

**یازیبُلاغی** **Yazîblağî**

لە دەوروبەری سەقز دوو ئاوایی بە نێوی یازیبڵاغی هەیە:

١. یازیبڵاغی دێیەکە سەر بە ناوچەی سەرای سەقز. ٩٤ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٥٦٩ کەسە.

٢ـ یازیبڵاغی ئاواییەکە سەر بە ناوچەی کولتەپەی سەقز. ١٧ ماڵە و ژمارەی دانیشتووانی ٦٨ کەسە.

ئەم وشەیە تورکییە و لە سێ بەش پێکهاتووە:

(یاز: بەهار[ف]بهار) + (بڵاغ، بولاغ: کانی، هانی، چاوە[ف]چشمه) + (ی: یای نیسبەت[ف]یاء نسبت)

**مانای تێکڕای وشەکە دەبێتە:** کانی بەهار؛ چاوەی بەهارانە[ف]چشمەی بهار

مەبەست لە کانی بەهار ئەوەیە ئەم کانییە لە وەرزی بەهاردا دەژێتەوە و ئاوی تێدێتەوە و ئاوی زۆر دەبێ. کانییەک تەنیا بەهاران ئاوی هەیە.

# یاپشخان

**یاپشخان** **Yapşxan**

دێیەکە سەر بە ناوچەی ساحێب. چۆڵکراوە.

**یەکەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە بنەڕەتدا «یاپیشقان»ە.

- یاپشخان، یاپیشقان: ١- چەسپ، سریش ٢- هەرزنی کێوی[ف] ١- چسب، سریش ٢- ارزن وحشی[1]

- یاپشخان: یاپیشقان= شتێکی پێوە دەنووسێ - شتێکی وەک گەنە یا کونجرە «نووسەنکە» پێوە دەچەسپێ و لێ نابێتەوە؛ سمج؛ کەسێکی وەک قیلی (قیری) کەوای سپی وایە و دەست هەڵناگرێ[ف] چسبندە، سمج، اصرار کنندە، سماجت کنندە.

که وا بوو **واتای تێکڕای وشەکە دەبێتە:**

- کەسێکی وەک چەسپ وایە و دەست هەڵگیر نییە و سەرسەختە؛ بە کەسی سەرسەخت و سمج دەڵێن[ف] شخص سمج؛ اصرار کنندە

وا دیارە لە کاتی چوونی تورکان بۆ ئەو دێیە کەسێک زۆر سمج بووە و وەڕەزی کردوون، بۆیە ئەو دێیەیان بەو نێوەوە کردووە.[ف] دە را بە نام شخصی سمج و اصرار کنندە نامگذاری کردەاند.

**دووەم.** ئەم وشەیە تورکییە و لە دوو بەش پێکهاتووە:

---

١ فەرهەنگی تورکی - فارسی شاهمەرەسی

(یاپش، یاپیش: دروست کردنی ماڵ؛ ساز کردنی خانووبەرە ف احداث کردن، ساخت) + (خان: ماڵ، خانوو، جاران بە کاروانسەرا و مسافیرخانەی نێو شارەکانیان دەگوت خان. بۆ نموونە وشەی خانچی یانی خانەچی، موسافیرخانەدار؛ یا قۆرخانە یانی خانوو و ماڵی ئەسڵەحە؛ ئەسڵەحەخانە

کە وا بوو **واتای سەرجەمی وشەی یاپشخان دەبێتە:** ساخت و ساز کردنی ماڵ ف ساخت و احداث ساختمان و خانە

دەتوانین بڵێین تورک کە چوونەتە نێو ئەو دێیە، ماڵی لێ دروست کراوە یا کاروانسەرای لێ ساز کراوە و هەر بەم بۆنەیەوە وایان نێو ناوە.

**سێهەم.** دەکرێ بڵێین کاتێ تورکەکان هاتوونەتە ئەو شوێنە، گیای هەرزی «کونجرە» یا «نووسەنکە» کە بە جل و شمەکەوە دەنووسێ، زۆر بووبێ و بەم بۆنەیەوە نێویان نابێ «یاپیشقان».

**قسەی دوایی:**

* لە کۆی گوندەکانی سەقز، چەند دێ هەیە کە تەنیا سووکەڵە ئاوڕێکمان لێ داونەتەوە. هۆی ئەم کارەش سادە و ساکار بوونی نێوەکانە، بە جۆرێ کە پێوییست بە شرۆڤە کردن ناکا. بەم چەشنەی خوارەوە:
* سەیفاوا «سیف‌آباد»: کەسێک بە نێوی سەیف یا سەیفوڵڵا ئاوەدانی کردۆتەوە.
* زامناوا «ضامن‌آباد»: بە نێوی پیاوچاکێکەوە کراوە.
* سەیداوا «سیدآباد»: کەسێکی سەید ئەم شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە. سەیداوای تیلەکۆ، سەیداوای ساحیب، سەیداوای ئاخکەند، سەیداوای جەمیان

شەریفاوا «شریف‌آباد»: کەسێک بە نێوی شەریف ئاوەدانی کردۆتەوە.

ساڵحاوا «صالح‌آباد»: کەسێک بە نێوی ساڵح ئاوەدانی کردۆتەوە. ساڵحاوای تیلەکۆ و ساڵحاوای دەوروبەری سەقز.

* عەلیاوا «علی‌آباد»: کەسێک بە نێوی عەلی ئاوەدانی کردۆتەوە. عەلیاوای تیلەکۆ، عەلیابادی ئایچی.
* میراوا «میرآباد»: گەورەپیاوێک یا کەسێکی میر ناو، ئاوەدانی کردۆتەوە.
* حەسەناوای قاشوق «حسن‌آباد قاشق»: کەسێک بە نێوی حەسەن ئاوەدانی کردۆتەوە.
* ڕەحیمئاوا «رحیم‌آباد»: ڕەحیم ناوێک ئاوەدانی کردۆتەوە.

فەیزاوا «فیض‌آباد»: کەسێک بە نێوی فەیز یا فەیزوڵڵا ئاوەدانی کردۆتەوە.

* کەریماوای ئەیاغچی «کریم‌آباد ایاغچی»: کەسێک بە نێوی کەریم ئاوەدانی کردۆتەوە.
* کەریماوا «کریم‌آباد»: کەسێک بە نێوی کەریم ئاوەدانی کردۆتەوە.
* مەحمووداوا «محمودآباد»: مەحموود ناوێک ئاوەدانی کردۆتەوە.

* ئەحمەداوا «احمدآباد»: ئەحمەد ناوێک ئاوەدانی کردۆتەوە. ئەحمەداوای سەرا، ئەحمەداوای سونج (کانی زێڕینە)
* حەسەناوای گوەرز «حسن‌آباد گودرز»: کەسێک بە نێوی حەسەن ئاوەدانی کردۆتەوە.
* عاقڵاوا «عاقل‌آباد»: کەسێکی ئاوەدانی کردۆتەوە پێیان عاقڵ و زانا بووە.
* تازاوای باشماغ «تازەآباد باشماغ»: دێیەکی تازە ئاوەدان کرابێتەوە.

مامەشا «ئیسلام ئاباد: اسلام‌آباد»: ئەو دێیە بە نێوی کەسێکەوە کراوە کە پێی گوتراوە مامەشا کە وشەیەکە بۆ ڕێز لێنان. پاش شۆڕشی ئیسلامی کراوە بە ئیسلام‌ئاباد.

قەڵاکۆنە «قلعەکهنە انوشیروانی»: ئەم دێیە بە نێوی قەڵای کۆنەی نێو دێیەکەوە کراوە.

قازی‌خان «قاضی‌خان»: کەسێک بە نێوی قازی‌خان ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە یا دواتر بە نێویەوە کراوە.

* گەورە قەڵا «گورە قلعە»: ئەو شوێنە قەڵایەکی گەورەی لێ بووە کە کردوویانە بە نێوی دێیەکە.

قارەمان «قهرمان»: پیاوێک بە نێوی قارەمان ئەو دێیەی ئاوەدان کردۆتەوە.

خانەقای شێخ «خانقاە شیخ»: ئەم دێیە بە نێوی شێخانی نەخشبەندی، نێویان ناوە خانەقای شێخ.

* مام سێوەدین (مام سیف‌الدین): کەسێک بە نێوی سەیفودین ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە.
* مەلا سالار (ملا سالار): ئەو دێیە بە نێوی پیاوێک بە نێوی مەلا سالار کراوە.
* میر سەید (میر سید): ئەو دێیە بە نێوی پیاوێک کراوە بە نێوی سەیدە گەورە؛ ئاغا سەید.

* نەوبەهار (نوبهار): بە بۆنەی ئەوەی شوێنێکی سەرسەوز و پڕگوڵ و گیا بووە ئەو نێوەیان لە سەر داناوە.
* گوێزێ (گویزی): بە بۆنەی ئەوەی ئەو شوێنە پڕ بووە لە داری گوێز بەو نێوەوە کراوە.
* شەمسە (شمسە): کەسێک بە نێوی شەمسەدین یا شەمسە ئەو شوێنەی ئاوەدان کردۆتەوە.
* سەرا (سرا): ماڵی دیوان (ادارە مرکزی)، جێگە (جای، سرای دولتی)، ماڵ، کاروانسەرا
* سێفەتاڵە (سیف تالە): بە بۆنەی ئەوەی داری سێوەتاڵە لەو شوێنە زۆر بووە، دێیەکەیان نێو ناوە سێفەتاڵە.
* تەخت (تخت): بە بۆنەی ئەوەی شوێنی دروست کردنی دێیەکە ساف و تەخت و بێکەند و لەندە، نێوی دێیەکەیان ناوە تەخت
* چەکوشە (چکشە): پێموایە شاخە گەورە لە چەکوش دەچێ، بەم هۆیەوە دێیەکەیان نێو ناوە چەکوشە.
* چنارە (چنارە): چۆمێک بە نێو دێیەکەدا تێدەپەڕێ و کەمێک دواتر دەڕژێتە نێو چۆمی جەعەتوو. بە بۆنەی ئەم چۆمە چنارێکی زۆری لێ بووە بۆیە نێویان ناوە چنارە.
* شێخ چۆپان (شیخ چوپان): دێیەکەیان بە نێوی سەید یا شێخێکی کە نێوی (شێخ چۆپان) بووە و لەوێ ژیاوە کردووە.
* خاپوورەدێ (خاپورەدە): وا دیارە ئەم دێیە لانیکەم جارێک سووتاوە و ڕووخاوە و وێران و خاپوور کراوە. دواتر کە دێیەکەیان دروست کردۆتەوە، نێویان ناوە دێ ڕووخاوەکە یا «خاپوورەدێ ـ خافوورەدێ».



وێنەی ١٥ـ گەڕەکێکی شاری سەقز، دەوروبەری مزگەوتی جامیعە و مەیدانی قودس. وێنە لە باشوورەوە بەرەو شمال هەڵگیراوە.
ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی (٢٠١١ی زایینی)



وێنەی ١٦ـ بولواری ساحلی ـ نێوان دووپرد ـ کامێرا لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژاوا وێنەی گرتووە. ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی (٢٠١١ی زایینی)



وێنەی ١٧ـ بولواری فەرمانداری ـ کامێرا لە شماڵەوە بەرەو باشوور گیراوە (مەیدانی قودس ڕوو بە پادگان) ساڵی ١٣٩٠ی هەتاوی (٢٠١١ی زایینی)

## ناوەرۆک: